# کورتەی

# توێشووی ئارامگران و سوپاسگوزاران

الإمام

إبن القيم الجوزية

کورتکردنەوەی

أحمد ملا فائق سعيد

کورتەی توێشووی ئارامگران و سوپاسگوزاران
الامام إبن القيم الجوزية
کورتکردنەوەی أحمد ملا فائق سعيد

﴿وَوَهَبۡنَا لِدَاوُۥدَ سُلَيۡمَٰنَۚ نِعۡمَ ٱلۡعَبۡدُ إِنَّهُۥٓ أَوَّابٌ﴾

[ص: ٣٠]

﴿وَٱذۡكُرۡ عَبۡدَنَآ أَيُّوبَ .... إِنَّا وَجَدۡنَٰهُ صَابِرٗاۚ نِّعۡمَ ٱلۡعَبۡدُ إِنَّهُۥٓ أَوَّابٞ﴾

[ص: ٤١-٤٤]

کورتەی

# توێشووی

# ئارامگران و سوپاسگوزاران

کورتکراوەی پەرتوکی

( عدة الصابرين )ی زانای پایە بەرز ( إبن القيم الجوزية )

بە دەستکاریەوە

نوسینی

أحمد ملا فائق سعيد

**ناوی کتێب: کورتەی توێشووی ئارامگران و سوپاسگوزاران**

**نوسەر: أحمد ملا فائق سعید**

**چاپ: دووەم**

**چاپخانە: سیما / سلێمانی - عێراق**

**ساڵی چاپ: ١٤٣٦ ك - ٢٠١٥ ز**

**ژمارەی سپاردن: (١٣٧٠) ساڵی ٢٠١٥ زایینی**

**بۆ لەچاپ دانەوەی:** ahmadmalafaiqsa3id@gmail.com

بسم الله الرحمن الرحيم

# پێشەکی

إن الحمد لله نحمده ونستعينه، ونستغفره، ونعوذ بالله من شرور أنفسنا وسيئات أعمالنا من يهده الله فلا مضل له ومن يضلل الله فلا هادي له. وأشهد أن لا إله إلا الله وحده لا شريك له وأشهد أن محمداً عبده ورسوله، وبعد:

زانای پایە بەرز (ابن القیم) رحمه الله یەکێکە لە زانا بەناوبانگەکانی جیهانی ئیسلامی، قوتابی قوتابخانەی (ابن تیمیة) رحمه الله، چەندەها نوسراوو باسی ئیسلامی بەنرخی هەیە، وە یەکێك لەو نوسراوە نایابانە پەرتوکی (عدة الصابرين وذخيرة الشاكرين)ە نوسراوێکی زۆر ڕۆحی و بەتام و چێژە، چارەسەری چەندەها گیروگرفتی ژیان دەکات بەشێوەیەکی زانیاری و ڕۆحی کە نە ڕوخاندن و بێ ئاوات نەبوونو دروست نەبوونی خەم و خەفەت و سستی و دروست بوونی غیرەت و توانا و هەوڵ و چەندەها کاری تری ئیمانی وەکو نەکردنی بەندایەتی بۆ مادده و ڕۆنەچوونە لە بریق و باقەکانی دونیادا کە کاری ئەم نوسینەیەتی لەناخی خوێنەردا، وە ئەم نووسراوە بریتییە لە پێناسەی ئارامگرتن و چەندەها بەڵگە و نمونەی ڕاستەقینەی ژیانی پێغەمبەر ﷺ و یارانی، وە بیروهەست و نەستی هەژارە ئارامگرەکان دەربارەی دونیاو ڕۆژی دوایی، وە باوەڕو ویست و

لەخواترسی دەوڵەمەندە سوپاسگوزارەکان کە هەردوو لایان تێکڕا هەوڵدەرن بۆ ڕۆژی دواییان، وە هەر لەم نوسراوەدا یەکلابوونەوەی باسێکمان بۆ بەئەنجام دێنێت کە ڕاو بۆچوونی زانایانی زۆر لەسەر بووە ئەویش (ئایا دەوڵەمەندێکی سوپاسگوزار باشترەو پلەی بەرزترە لای خوا یا هەژارێکی ئارامگر؟)، وە بۆ پشتگیری لە بابەتەکە هەندێك بەسەرهات و فەرموودەم بۆ زیاد کردووە لەهەندێك پەرتووك لەگەڵ دانی سەرچاوەکەدا وە دەرکردنی زۆر دووبارەبوونەوەی هەندێك بابەت و نەنووسینی هەندێکی تر لەبەر وردەکارییەکی زانستی کە هەموو کەس پێویستی پێی نییە، وە ئیتر ئەوەندەی بەباش و بەکەڵکم زانیبێت لەباسەکەدا لێم وەرگێڕاوە بە دەستکارییەوە، وە هیوام وایە شوێنی ڕەزامەندی خوای گەورە بێت، وە خوێنەریش بێ بەشمان نەکات لە دوعای خێر لەگەڵ ئەو کەسانەی کە ئەرکی پیاچوونەوە و نووسینەوەیان لەپێناودا چەشتووە.

وصلى الله وسلم وبارك على نبينا محمد وعلى آله وأصحابه

أحمد ملا فائق سعيد

٤ / رجب / ١٤١٤ هـ

٢٤ / ١٠ / ١٩٩٤ م

# ئارامگرتن (الصبر)

(الصبر) لە زمانەوانی دا: واتای (المنع) گرتن وە نەهێشتن.

لە پێناسەدا: واتای گرتنی دەروون لە نارەحەتی، وە زمان لە سکالا، وە ئەندامەکانی لاشە لە یەخەدادڕین و ڕنینەوەی قژ و ڕوومەتو... .

واتای (صبر) زانایان بە چەندەها جۆر واتایان لێکداوەتەوە، وەك هەندێکیان دەڵێن: (ڕەوشتێکی بەرزی دەروونە کە بەربەرەکانی ئەکات بەرامبەر هەموو کردارێکی نارێك و ناپەسەند) لەوانەش:

١- (جونەیدی بەغدادی) ﷬ دەفەرموێت: چەشتنی تاڵی بەبێ پێناخۆش بوون.

٢- (زونونی میسری) ﷬ دەفەرموێت: دەربڕینی دەوڵەمەندی لەکاتی هەژاری لەگۆڕەپانی ژیان دا.

٣- (عەمری کوڕی عوسمان) ﷬ دەفەرموێت: ئارامگرتن لەگەڵ خوادا بەرامبەر بەلاکانی.

٤- (خواص) ﷬ دەفەرموێت: ڕاوەستان بەرامبەر یاسای قورئان و سوننەت.

٥- (عومەری کوڕی خەتاب) ﷺ دەفەرموێت: باشترین ژیان بە ئارامگرتن دەستمان کەوتووە.

٦- (ابن القيم) ﷫ دەفەرموێت: ئارامگرتن لەسەر پەیڕەوی و فەرزەکانی خواو ئارامگرتن لەسەر ئارەزووی دەروون[1].

٧- وە دەفەرموون: بەربەرەکانی کردنی دوو لایەنی بەرامبەر، دین و ئەقڵ بەرامبەر ئارەزووی دەروون.

٨- (شێخ عبدالقادری گەیلانی) ﷫ دەفەرموێت: ئارامگرتن لەسەر سێ شت بەندە:

**یەکەم:** ئارامگرتن لەسەر فەرمانەکانی خوا وەکو: (نوێژ و ڕۆژوو... هتد).

**دووەم:** ئارامگرتن لەسەر ئەوانەی کە خوا فەرمانی بە نەکردنی داوە.

**سێیەم:** ئارامگرتن لەسەر قەزاو قەدەر.

وە هەر ئەو سیانەیە کە (لوقمان) ﷺ ئامۆژگاری کوڕەکەی پێکردووە: ﴿ يَـٰبُنَيَّ أَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ وَأۡمُرۡ بِٱلۡمَعۡرُوفِ وَٱنۡهَ عَنِ ٱلۡمُنكَرِ وَٱصۡبِرۡ عَلَىٰ مَآ أَصَابَكَۖ إِنَّ ذَٰلِكَ مِنۡ عَزۡمِ ٱلۡأُمُورِ ﴾ [لقمان : ١٧]، وە فەرمانی

---

(١) مدارج السالكين جـ٢ ص١٥٢.

خواشی لـەسەرە: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱصۡبِرُواْ وَصَابِرُواْ وَرَابِطُواْ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ لَعَلَّكُمۡ تُفۡلِحُونَ ﴾ [آل عمران : ٢٠٠].

٩- وە هەندێك دەڵێن: ئارامگر واتە خاوەنی نارِەحەتی، ئەگەر لـەناو كۆمەڵێك دا بوو ئەبێ لـێیان جیا نەكرێتەوە، واتە پێوەی دیار نەبێت.

## ئایەتە قورئانییەکان لەسەر ئارامگرتن

زانای پایە بەرز (ئەحمەدی كوڕی حەنبەل) رَحِمَهُ ٱللَّهُ دەفەرموێت: خوای گەورە لـە قورئان دا باسی ئارامگرتنی كردووە لـە نەوەد شوێن دا.

وە هەندێك شوێن لـەو ئایەتانە:

١- بەشێوەی فەرمان (الأمر) بە پشتبەستن بە خوا لـە كاتی ئارامگرتن دا: ﴿ وَٱصۡبِرۡ وَمَا صَبۡرُكَ إِلَّا بِٱللَّهِ ﴾ [النحل : ١٢٧].

٢- نەكردنی پێچەوانەیەتی (النهي)، واتە لـەكاتی ئارامگرتن دا دڵگران و خەفەتبار مەبن: ﴿وَلَا تَهِنُواْ وَلَا تَحۡزَنُواْ ﴾ [آل عمران : ١٣٩].

٣- ڕزگاربوون و سەرکەوتنی پەیوەست کردووە بە ئەنجامی ئارامگرتنەوە، وەك دەفەرمویێت: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱصْبِرُواْ وَصَابِرُواْ وَرَابِطُواْ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ﴾ [آل عمران : ٢٠٠].

٤- پاداشتی دوو جارە بۆ ئارامگرتن: ﴿أُوْلَٰٓئِكَ يُؤْتَوْنَ أَجْرَهُم مَّرَّتَيْنِ بِمَا صَبَرُواْ وَيَدْرَءُونَ بِٱلْحَسَنَةِ ٱلسَّيِّئَةَ وَمِمَّا رَزَقْنَٰهُمْ يُنفِقُونَ﴾ [القصص : ٥٤].

٥- ئەنجامی ئارامگرتن و پتەوبوون لەسەری ئەبێت بە پێشەوا (إمامة)ی چاکە بۆ خەڵکی: ﴿وَجَعَلْنَا مِنْهُمْ أَئِمَّةً يَهْدُونَ بِأَمْرِنَا لَمَّا صَبَرُواْ ۖ وَكَانُواْ بِـَٔايَٰتِنَا يُوقِنُونَ﴾ [السجدة : ٢٤].

٦- خوای گەورە لەگەڵ ئارامگراندایە، بەدەستهێنانی لەگەڵا بوونی خوادا: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلصَّٰبِرِينَ﴾ [البقرة : ١٥٣].

٧- سێ پلەی بەرز ئەنجامی ئارامگرانە: چاودێری خوا، بەزەیی، ڕێنمونی: ﴿وَبَشِّرِ ٱلصَّٰبِرِينَ ۝١٥٥ ٱلَّذِينَ إِذَآ أَصَٰبَتْهُم مُّصِيبَةٌ قَالُوٓاْ إِنَّا لِلَّهِ وَإِنَّآ إِلَيْهِ رَٰجِعُونَ ۝١٥٦ أُوْلَٰٓئِكَ عَلَيْهِمْ صَلَوَٰتٌ مِّن رَّبِّهِمْ وَرَحْمَةٌ ۖ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُهْتَدُونَ﴾ [البقرة : ١٥٥ - ١٥٧].

٨- خوای گەورە ئارامگرتنی کردووە بە پاڵپشت بۆ باوەڕداران:

﴿ٱسۡتَعِينُواْ بِٱلصَّبۡرِ وَٱلصَّلَوٰةِ﴾ [البقرة : ١٥٣].

٩- وە ئارامگرتن و خواپەرستی ئەنجامی سەرکەوتنی موسوڵمانانە: ﴿بَلَىٰٓۚ إِن تَصۡبِرُواْ وَتَتَّقُواْ وَيَأۡتُوكُم مِّن فَوۡرِهِمۡ هَٰذَا يُمۡدِدۡكُمۡ رَبُّكُم بِخَمۡسَةِ ءَالَٰفٖ مِّنَ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةِ مُسَوِّمِينَ﴾ [آل عمران : ١٢٥].

١٠-ئارامگرتن باوەڕدار دەپارێزێت لە هەموو فڕوفێڵێکی دوژمن:

﴿وَإِن تَصۡبِرُواْ وَتَتَّقُواْ لَا يَضُرُّكُمۡ كَيۡدُهُمۡ شَيۡـًٔاۗ﴾ [آل عمران : ١٢٠].

١١-لە پاداشتی ئارامگرتن دا خوا بەهەشتتان پێ دەبەخشێت، وە فریشتەکان سڵاوتان لێدەکەن: ﴿وَٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ يَدۡخُلُونَ عَلَيۡهِم مِّن كُلِّ بَابٖ ٢٣ سَلَٰمٌ عَلَيۡكُم بِمَا صَبَرۡتُمۡۚ﴾ [الرعد : ٢٣ - ٢٤].

١٢-وە پاداشتیان لێخۆشبوون و پلە بەرزییە: ﴿إِلَّا ٱلَّذِينَ صَبَرُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ أُوْلَٰٓئِكَ لَهُم مَّغۡفِرَةٞ وَأَجۡرٞ كَبِيرٞ﴾ [هود : ١١].

١٣-خوای گەورە ئارامگرتنی بە جوانترین ڕەوشت داوەتە قەڵەم:

﴿وَلَمَن صَبَرَ وَغَفَرَ إِنَّ ذَٰلِكَ لَمِنۡ عَزۡمِ ٱلۡأُمُورِ﴾ [الشورى : ٤٣].

١٤–خوای گەورە مرۆڤی ئارامی خۆش دەوێت: ﴿وَٱللَّهُ يُحِبُّ ٱلصَّٰبِرِينَ﴾ [آل عمران: ١٤٦].

١٥–ئارامگرەکان زۆر سوودو پەند لە فەرمانەکانی خوا وەردەگرن: ﴿وَلَقَدۡ أَرۡسَلۡنَا مُوسَىٰ بِـَٔايَٰتِنَآ أَنۡ أَخۡرِجۡ قَوۡمَكَ مِنَ ٱلظُّلُمَٰتِ إِلَى ٱلنُّورِ وَذَكِّرۡهُم بِأَيَّىٰمِ ٱللَّهِۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَٰتٖ لِّكُلِّ صَبَّارٖ شَكُورٖ﴾ [إبراهيم : ٥].

١٦–ئارامگرتن تەواوکەری فەرمانەکانی ئیسلامە، وە ئەڵقەیەکی نەپچڕاوەیە لێیان، وەك پەیوەندی بە نوێژەوە بەستووە: ﴿وَٱسۡتَعِينُواْ بِٱلصَّبۡرِ وَٱلصَّلَوٰةِ﴾ [البقرة : ٤٥]، وە بە کردەوەی باشەوە: ﴿إِلَّا ٱلَّذِينَ صَبَرُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ﴾ [هود : ١١]، وە بە خواپەرستییەوە: ﴿إِنَّهُۥ مَن يَتَّقِ وَيَصۡبِرۡ﴾ [يوسف : ٩٠] ، وە بە سوپاس و ستایشەوە: ﴿إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَٰتٖ لِّكُلِّ صَبَّارٖ شَكُورٖ﴾ [إبراهيم : ٥]، وە پەیوەندی بە ڕاستی و دادپەروەرییەوە: ﴿وَتَوَاصَوۡاْ بِٱلۡحَقِّ وَتَوَاصَوۡاْ بِٱلصَّبۡرِ﴾ [العصر : ٣]، وە دەفەرموێت: ﴿وَتَوَاصَوۡاْ بِٱلصَّبۡرِ وَتَوَاصَوۡاْ بِٱلۡمَرۡحَمَةِ﴾ [البلد : ١٧]، وە بە دامەزراندن و پتەوبوونی باوەڕەوە: ﴿لَمَّا صَبَرُواْۖ وَكَانُواْ بِـَٔايَٰتِنَا

يُوقِنُونَ﴾ [السجدة : ٢٤]، وە بە ڕاستگۆیی: ﴿وَٱلصَّٰدِقِينَ وَٱلصَّٰدِقَٰتِ وَٱلصَّٰبِرِينَ وَٱلصَّٰبِرَٰتِ﴾ [الأحزاب : ٣٥].

## فەرموودەکانی پێغەمبەر ﷺ لەسەر ئارامگرتن

وە ئێستاش هەندێ لە فەرموودەکانی پێغەمبەر ﷺ لەسەر ئارامگرتن باس دەکەین:

١- پێغەمبەر ﷺ بەلای ئافرەتێك دا تێپەڕ بوو کە دەگریا لەسەر گۆڕی کوڕەکەی، پێی فەرموو: «اتَّقِ اللهَ وَاصْبِرِي» واتە: ئارام بگرە و خوا بپەرستە، ئافرەتەکە وتی: تۆ نازانی چیم بەسەردا هاتووە! (ئافرەتەکە پێغەمبەری نەناسی)، کاتێ پێغەمبەر ﷺ تێپەڕبوو پیاوێك پێی وت: ئەوە پێغەمبەر بوو قسەی لەگەڵ کردی! ئافرەتەکە لەتاودا وەك مردووی لێهات، هەڵسا بەپەلە چوو بەدوایدا، تا پێی گەیی و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا نەمناسیت (واتە گوێڕایەڵیت دەکەم). پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: «إِنَّمَا الصَّبْرُ عِنْدَ الصَّدْمَةِ الأُولَى»[١].

واتە: ئارامگرتن لە یەکەم کات دایە، (واتە لەکاتی تازە مردنی دا).

(١) رواه البخاري (١٢٥٢)، ومسلم (٩٢٦).

٢- دایکی موسڵمانان (أم سلمة) ﵂ ئەڵێت: کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: «مَا مِنْ مُسْلِمٍ تُصِيبُهُ مُصِيبَةٌ، فَيَقُولُ مَا أَمَرَهُ اللهُ: ﴿إِنَّا لِلَّهِ وَإِنَّآ إِلَيۡهِ رَٰجِعُونَ﴾ [البقرة : ١٥٦]، اللهُمَّ أْجُرْنِي فِي مُصِيبَتِي، وَأَخْلِفْ لِي خَيْرًا مِنْهَا، إِلَّا أَخْلَفَ اللهُ لَهُ خَيْرًا مِنْهَا»(١).

واتە: هەر موسڵمانێك بەڵایەكی بەسەردا هات ئەو ئایەتە بلێت كە خوا فەرمانی پێداوە: ﴿إِنَّا لِلَّهِ وَإِنَّآ إِلَيۡهِ رَٰجِعُونَ﴾ [البقرة : ١٥٦] ئەوا خوا شوێنی بە خێرو چاكە بۆ پڕدەكاتەوە. وە هەروەها لە فەرموودەیەكی تردا دەفەرموێت: «إِذَا ابْتَلَيْتُ عَبْدِي بِحَبِيبَتَيْهِ فَصَبَرَ، عَوَّضْتُهُ مِنْهُمَا الجَنَّةَ»(٢).

واتە: ئەگەر هەردوو خۆشەویستێكم لە بەندەیەكم سەندەوە (واتە هەردوو چاوی)و ئارامی گرت ئەوە پاداشتی بەهەشتە.

٣- وە دەگێڕنەوە كە پێغەمبەر ﷺ چەند پارەو موڵكێكی بەش دەكرد بەسەر موسوڵمانان دا كەسێك وتی: ئەم شێوە بەشكردنە ویستی خوای تێدا نییە، كاتێك ئەمەیان بۆ پێغەمبەر گێڕایەوە

---

(١) رواه مسلم (٩١٨)، وأبو داود (٣١١٩).

(٢) رواه البخاري (٥٦٥٣).

فەرمووی: «رَحِمَ اللَّهُ مُوسَى قَدْ أُوذِيَ بِأَكْثَرَ مِنْ هَذَا فَصَبَرَ»(١).

واتە: خوا لە موسا خۆش بێت لەم شێوەیە زیاتر ئازاریان ئەداو ئارامی گرت.

٤- وە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: «مَا يُصِيبُ الْمُسْلِمَ، مِنْ نَصَبٍ وَلاَ وَصَبٍ، وَلاَ هَمٍّ وَلاَ حُزْنٍ وَلاَ أَذًى وَلاَ غَمٍّ، حَتَّى الشَّوْكَةِ يُشَاكُهَا، إِلَّا كَفَّرَ اللَّهُ بِهَا مِنْ خَطَايَاهُ»(٢).

واتە: هەرکارێك تووشی موسڵمان بێت لە خەمو خەفەت و بەڵاو ئازار، هەتا درِکێکیش بچێت بە لاشەی دا خوا تاوان و هەڵەی پێ لا ئەبات.

٥- وە لە گێرِانەوەیەکی تردا دەفەرموێت: «... إِلَّا رَفَعَهُ اللَّهُ بِهَا دَرَجَةً، أَوْ حَطَّ عَنْهُ بِهَا خَطِيئَةً»(٣).

واتە: خوای گەورە هەر پلەیەك بەرزی دەکاتەوەو تاوانێکی پێ لادەبات.

---

(١) رواه البخاري (٥٦٤٠)، ومسلم (٤٩).

(٢) رواه البخاري (٥٦٤١)، ومسلم (٢٥٧٣).

(٣) رواه مسلم (٢٥٧٢).

٦- پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: «... وَإِنَّ اللهَ إِذَا أَحَبَّ قَوْمًا ابْتَلَاهُمْ، فَمَنْ رَضِيَ فَلَهُ الرِّضَا، وَمَنْ سَخِطَ فَلَهُ السُّخْطُ »[١].

واتە: ئەگەر خوای پەروەردگار خەڵکێکی خۆش بوێت ناخۆشییەکان دەدات بەسەریان دا، ئەوەی ڕازی بێت ئەوا بەر ڕازی بوونی خوا دەکەوێت، وە گەر ڕازی نەبێت ئەوا بەر نارەزایی خوا دەکەوێت.

٧- پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: «إِذَا اشْتَكَى الْمُؤْمِنُ أَخْلَصَهُ اللهُ كَمَا يُخَلِّصُ الْكِيرُ خَبَثَ الْحَدِيدِ»[٢].

واتە: گەر ئیمانداریك ئازاری تووش بوو پاکی دەکاتەوە لە تاوانەکانی، وەکو چۆن کورەی ئاگر ئاسن پاك دەکاتەوە لە پیسییەکانی.

٨- پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: «مَا مِنْ مُسْلِمٍ يُصِيبُهُ أَذًى، مَرَضٌ فَمَا سِوَاهُ، إِلَّا حَطَّ اللهُ لَهُ سَيِّئَاتِهِ، كَمَا تَحُطُّ الشَّجَرَةُ وَرَقَهَا»[٣].

واتە: موسوڵمانێك نییە لەسەر زەوی توشی نەخۆشییەك یان هەر

---

(١) رواه الترمذي (٢٣٩٦)، وابن ماجه (٤٠٣١)، والصحيحة (١٢٢٠).

(٢) رواه البخاري في " الأدب المفرد " (٤٩٧).

(٣) رواه البخاري (٥٦٤٨)، ومسلم (٢٥٧١).

شتێکی تر بێت، خوای پەروەردگار تاوانەکانی پێ دەسڕێتەوە وەکو درەختێکی وشك بوو کە گەڵاکەی بوەرێت.

٩- وە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: «إِنَّ الرَّجُلَ لِتَكُونَ لَهُ عِنْدَ اللَّهِ الْمَنْزِلَةُ، فَمَا يَبْلُغُهَا بِعَمَلٍ، فَلَا يَزَالُ اللَّهُ يَبْتَلِيهِ بِمَا يَكْرَهُ حَتَّى يُبَلِّغَهُ إِيَّاهَا»[(١)].

واتە: پیاوێك پلەیەکی هەیە لای خوای پەروەردگاری، نایگاتێ بە کردەوە، بەڵا دەدرێت بەسەر لاشەی دا تا دەیگاتێ.

واتە نەخۆشکەوتن کاتێکە لەو کاتانەی نزای تێدا وەردەگیرێت.

١٠- وە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: «عَجَبًا لِأَمْرِ الْمُؤْمِنِ، إِنَّ أَمْرَهُ كُلَّهُ خَيْرٌ، وَلَيْسَ ذَاكَ لِأَحَدٍ إِلَّا لِلْمُؤْمِنِ، إِنْ أَصَابَتْهُ سَرَّاءُ شَكَرَ، فَكَانَ خَيْرًا لَهُ، وَإِنْ أَصَابَتْهُ ضَرَّاءُ، صَبَرَ فَكَانَ خَيْرًا لَهُ»[(٢)].

واتە: سوێند بەوەی گیانی منی بەدەستە هەر فەرمانێك خوا بیدا بەسەر بەندەیەکی دا هەر بەخێرو چاکە بۆی دەنوسرێت، ئەگەر فەرمانەکەی خوا تووشی خێری کردووە سوپاسی خوای لەسەر کرد

---

(١) رواه ابن حبان (٢٩٠٨)، والحاكم (١/ ٣٤٤)، وأبو يعلى في " مسنده " (٦٠٩٥)، والصحيحة (٢٥٩٩).

(٢) رواه مسلم (٢٤٩٩)، وأحمد (٥/ ٢٦).

ئەوا خواش بەخێر بۆی ئەنوسێت، وە ئەگەر زیانو نارەحەتی بوو وە ئارامی لەسەر گرت ئەوە خواش بە خێرو چاکە بۆی دەنوسێت، ئەمە بۆ هیچ کەس نییە ئەگەر موسڵمان نەبێت.

## وتەی یاوەرانی پێغەمبەر ﷺ و زانایان

١- عومەری کوڕی خەتاب رضي الله عنه ئەفەرموێت: «إِنَّا وَجَدْنَا خَيْرَ عَيْشِنَا بِالصَّبْرِ»(١).

واتە: سەبرو ئارامگرتن خۆشترین ژیانی بۆ ڕەخساندووین.

٢- عەلی کوڕی ئەبی تالیب رضي الله عنه ئەفەرموێت: «الصَّبْرُ مِنَ الْإِيمَانِ بِمَنْزِلَةِ الرَّأْسِ مِنَ الْجَسَدِ مَنْ لَا صَبْرَ لَهُ لَا إِيمَانَ لَهُ»(٢).

واتە: ئارامگرتن لە ئیمان دا وەك سەر وایە لە لاشەدا، وە هیچ کەس ئیمانی تەواو نییە ئەگەر ئارام نەگرێت.

٣- (عومەری کوڕی عبدالعزیز) رضي الله عنه دەفەرموێت: «مَا أَنْعَمَ اللهُ عَلَى عَبْدٍ مِنْ نِعْمَةٍ فَانْتَزَعَهَا مِنْهُ فَعَاضَهُ مِمَّا انْتَزَعَ مِنْهُ صَبْرًا إِلَّا كَانَ

---

(١) رواه أحمد في " الزهد " ص١٤٠، وأبو نعيم في " الحلية " (١/ ٣٤).

(٢) رواه ابن أبي شيبة في " الإيمان " (١٣٠)، واللالكائي في " الإعتقاد " (١٥٦٩).

الَّذِي عَاضَهُ خَيْرًا مِمَّا انْتَزَعَ مِنْهُ»[(١)].

واتە: هەر نیعمەتێك خوا لە بەندەکەی وەرگرتەوە ئارامگرتنی پێ دەبەخشێت لە شوێنی ئەو نیعمەتە.

وە ئارامگرتنیش نیعمەتێکی خوایە، هەندێك لە سەلەف فەرموویانە: ﴿فَصَبۡرٞ جَمِيلٞ﴾ [يوسف : ١٨] مانای ئەوەیە بە ئارامگرتنێك نارەزایی تێدا نەبێت[(٢)].

٤- (سەعیدی کوڕی جوبەیر) رضي الله عنه دەفەرموێت: «الصَّبْرُ اعْتِرَافُ الْعَبْدِ للهِ بِمَا أَصَابَهُ مِنْهُ، وَاحْتِسَابُهُ عِنْدَ اللهِ رَجَاءَ ثَوَابِهِ»[(٣)].

واتە: ئارامگرتن داننانی ئادەمیزادە بە خواو داوای پاداشتە لێی، وەك واتای ﴿إِنَّا لِلَّهِ وَإِنَّآ إِلَيۡهِ رَٰجِعُونَ﴾ی کردبێت، دان دەنێت بەوەی خوای گەورە خاوەنی هەموو بوونەوەرێکە، خۆی هەڵی دەسوڕێنێت، ﴿إِنَّا لِلَّهِ وَإِنَّآ إِلَيۡهِ رَٰجِعُونَ﴾ ئێمەش ئەیگێڕینەوە بۆ لای، واتە ئەڵێین بە ویستی خواو تاوەکو پاداشتمان بداتەوە.

(١) رواه البيهقي في " شعب الإيمان " (١٠٠٣٨)، وابن أبي الدنيا في " الصبر " (٣٦).

(٢) الدر المنثور (٤/ ٥١٤).

(٣) رواه ابن المبارك في " الزهد " (١١١)، وابن أبي الدنيا في " الصبر " (١١٣).

٥- پرسیاریان کرد لە خواناسێك تەواوی ئارامگرتن چۆنە؟ وتی: «أَنْ يَكُونَ يَوْمَ تُصِيبُهُ الْمُصِيبَةُ مِثْلَهُ قَبْلَهَا»[(١)].

واتە: ئەبێ ئەو ڕۆژەی بەڵاکەی بەسەردا هاتووە وەك دوێنێ وابێت کە بەڵاکەی بەسەردا نەهاتووە.

## ئارامگرتن و جیاوازی پلەکانی

ئارامگرتن بەگوێرەی پلەو پاداشت لای خوای گەورە دوو جۆرە:

١- ئارامگرتنی هەڵبژاردەیی (إختياري).

٢- ئارامگرتنی بێدەستەڵات (إضطراري).

ئارامگرتنێك بە ویستو ڕەزامەندی و هەڵبژاردنی خۆت بێت پلە بەرزترەو مایەی هەموو پاداشت و ڕێزێکە لای پەروەردگار، واتە لەبەر پاداشت و ڕەزامەندی خوا پێت خۆشە ئەو ناخۆشیانەت بەسەردا بێت تاوەکو ئارامگرتنێك کە هیچ دەسەڵاتێکی خۆتی تێدا نییە و لەپڕ بێت بەسەرتاو بێئاگا بیت لێی ئیتر بە ناچاری ئارامی لەسەر بگریت.

**نموونە:** هەروەك ئارامگرتنی (یوسف) عليه السلام لەسەر فێڵی ئافرەتەکان و زیندانی لە سەری: ﴿قَالَ رَبِّ ٱلسِّجْنُ أَحَبُّ إِلَيَّ مِمَّا

(١) رواه ابن أبي الدنيا في " الصبر " (١١٤).

يَدۡعُونَنِيٓ إِلَيۡهِ﴾ [يوسف : ٣٣]. ئەمەیان پلە بەرزترە، وە خوای گەورە بە وەسف ناوی دەبات تاوەكو جۆری دووەم كە بە بێ دەسەڵات ئارامی لەسەر گرت، هەروەك ئارام گرتنەكەی لەسەر فێڵی براكانی و خستنە ناو بیرو فرۆشتنی بەشێوەی بەندە، لەبەر ئەوە ئارامگرتنی (إختياري) دوو بەشە لە سێ بەشەكەی ئارامگرتن، كە ئەویش:

١) الأمر (لەسەر فەرمانەكانی خوای پەروەردگار).

٢) النهي (لەسەر قەدەغەكراوەكانی خوای پەروەردگار).

وە هەروەها وەكو پێغەمبەران (ئیبراهیم و موسا و نوح و عیسا) عليهم السلام ئارامیان گرت لەسەر ئەو هەموو دژایەتییە كە بەسەریان دا هات لەپێناوی (توحيد)دا، بۆیە ناوبراون بە (ألوا العزم) خاوەنی هەڵوێست و ئارامی لەسەر دژایەتی كردنەكان بەرەزامەندی خۆیان بووە، بۆیە خوای گەورە فەرمان ئەدات بە محمد ﷺ كە وەك ئەو پێغەمبەرانە هەڵوێستی ئارامی ڕەزامەندیت هەبێت: ﴿فَٱصۡبِرۡ كَمَا صَبَرَ أُوْلُواْ ٱلۡعَزۡمِ مِنَ ٱلرُّسُلِ﴾ [الأحقاف : ٣٥]، ئەمانە هەموویان ئارامگرتنیان هەڵبژارد بۆیە فەرمان دەدات بە پێغەمبەرەكەی ﷺ كە وەكو ئەوان وابێت نەك وەكو ئەوانەی لە ناچاری دا ئارامیان گرت، لەبەر ئەوەی پلەی كەمترە: ﴿فَٱصۡبِرۡ لِحُكۡمِ رَبِّكَ وَلَا تَكُن كَصَاحِبِ ٱلۡحُوتِ إِذۡ نَادَىٰ وَهُوَ

مَكۡظُومٞ﴾ [القلم : ٤٨]، لەبەرئەوەی (یونس) ﷺ ئارامگرتنی (إختیاري) نەبوو بەڵکو ئارامگرتنی ناچاری هەبوو (إضطراری)، بەڵکو بەشی دووەمیش بێبەش نییە لە پاداشت هەروەك لەدوای ئەوەوە دەفەرموێت: ﴿فَنَادَىٰ فِي ٱلظُّلُمَٰتِ أَن لَّآ إِلَٰهَ إِلَّآ أَنتَ سُبۡحَٰنَكَ إِنِّي كُنتُ مِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴾ [الأنبياء : ٨٧]، هەروەك (ئەیوب) ﷺ هەمان ئارامگرتنی هەبوو: ﴿وَأَيُّوبَ إِذۡ نَادَىٰ رَبَّهُۥٓ أَنِّي مَسَّنِيَ ٱلضُّرُّ وَأَنتَ أَرۡحَمُ ٱلرَّٰحِمِينَ ﴾ [الأنبياء : ٨٣].

وە هەروەها (یەعقوب) ﷺ بەهەمان شێوە دەفەرموێت ﴿قَالَ إِنَّمَآ أَشۡكُواْ بَثِّي وَحُزۡنِيٓ إِلَى ٱللَّهِ﴾ [یوسف : ٨٦]. کەواتە ئارامگرتنێکی ناچاری (إضطراری) بێبەش نییە لە پاداشت، وە لە ڕەزامەندی خوا، بەڵکو یەکەمیان کە خاوەنەکەی بە ڕەزامەندی خۆی هەڵیدەبژێرێت پتەوترو مایەی ڕەزامەندی و پلە بەرزترە لای خوای گەورە، واتە هەردوو جۆرەکەی ئارامگرتن پاداشت و پلە بەرز و ناوبراون لای خوای گەورە هەروەك قورئان هەردوو لایان باس دەکات وە (حیکمەت) لە ئارامگرتن دا گەڕانەوەیە بۆلای خوای خۆت‌و داوای یارمەتی لێکردنەو لاوازی و بەندایەتی دەربڕینە، وەك دەفەرموێت:

﴿وَلَقَدْ أَخَذْنَاهُم بِالْعَذَابِ فَمَا اسْتَكَانُوا لِرَبِّهِمْ وَمَا يَتَضَرَّعُونَ﴾ [المؤمنون : ٧٦].

**واتە:** بەڵاکانمان دان بەسەریان دا نەگەڕانەوە لە کارەکانی پێشوویان، لە کوفرو تاوان و ملکەچ نەبوون، وە هیچ داواو نزایان لە خوا نەدەکرد[١].

## ئەو هۆیانەی یارمەتی دەدەن لەسەر ئارامگرتن

ئارامگرتن کارێکی بەدەستهێنان (إکتساب)ییە، بۆیە بۆ بەدەستهێنانی ئەو کارە پێویستیت بە هەندێك ڕوونکردنەوەو پێشەکی هەیە وەکو هۆکارێك بۆ یارمەتیدانی ئەو کارە، بۆیە هەندێك لەو هۆیانە باس دەکەین لەوانە:

١- زانیاری و ئاگاداربوون بەسەر سروشتی ژیان دا کە دەبێت بەرزو نزمی تێدا بێت وەکو: (جوانی و ناشیرینی و دەوڵەمەندی و هەژاری و خۆشی و ناخۆشی و زانین و نەزانین و... هتد).

لەبەر ئەوەی ژیان بەبێ ئەمانە پێکنایەت، وە ئەبێت هەمووی بەسەریا بێت ئەوەی لەسەری نووسرابێت: «جَفَّ الْقَلَمُ بِمَا أَنْتَ

---

(١) تفسير ابن كثير جـ٥ ص٤٢٤.

لاَقٍ»[(١)]، کە ئەمەت زانی ئەبێتە مایەی بچووکبوونەوە و سروشتی کارەکە.

٢- دروستبوونی باوەڕی تەواو بە پاداشتی ئەو ناخۆشییە تاوەکو تاڵی ناخۆشییەکەت لا کەم بێتەوە، هەروەك نەخۆشێك چۆن پێی خۆشەو ڕازییە ئەو دەرمانە تاڵە بخوات لەبەر زۆری سوودەکەی ﴿وَلَنَجْزِيَنَّ ٱلَّذِينَ صَبَرُوٓاْ أَجْرَهُم بِأَحْسَنِ مَا كَانُواْ يَعْمَلُونَ﴾ [النحل : ٩٦] پاداشتیان بەباشتر لە کردەوەکانیان دەدرێتەوە.

٣- دروستبوونی باوەڕی تەواو بەوەی کە بە هەتاهەتایی بەسەریەوە نابێت بەڵکو پاش ماوەیەك لادەچێت: ﴿فَإِنَّ مَعَ ٱلْعُسْرِ يُسْرًا﴾ [الشرح : ٥]، ﴿فَٱصْبِرْ إِنَّ ٱلْعَٰقِبَةَ لِلْمُتَّقِينَ﴾ [هود : ٤٩].

٤- پەنا بردنە بەر پەروەردگاری خۆت کە یارمەتیت بدات لەسەر ئارامگرتن و باشترین یارمەتی دەرە بۆ ئارامگرتن: ﴿وَٱصْبِرْ وَمَا صَبْرُكَ إِلَّا بِٱللَّهِ﴾ [النحل : ١٢٧]، ﴿رَبَّنَآ أَفْرِغْ عَلَيْنَا صَبْرًا﴾ [البقرة : ٢٥٠]، ئەمەش بە دوعاو زیکر دەبێت لەکاتی ناخۆشیەکەدا.

(١) صحيح الجامع الصغير وزيادته (٧٩٥٧).

٥- بۆ یارمەتیدانت لەسەر ئارامگرتن چاو لە کارو پاشەڕۆژی ئارامگران بکە: ﴿فَٱصۡبِرۡ كَمَا صَبَرَ أُوْلُواْ ٱلۡعَزۡمِ مِنَ ٱلرُّسُلِ﴾ [الأحقاف: ٣٥]، هەروەك پێغەمبەر ﷺ باسی موسڵمانانی زووی دەکرد بۆ یاوەرەکانی لە مەککەدا تاوەکو ئارامگرو بەهێزتر بن و نەڕوخێن و پشت نەدەنەوە.

٦- یارمەتیدانێکی تر باوەڕبوونە بەوەی کە بەهۆی کارە خراپەکانەوە خوای گەورە ناخۆشی بەسەر ئادەمیزاد دا دەدات زۆرکات: ﴿وَمَآ أَصَٰبَكُم مِّن مُّصِيبَةٖ فَبِمَا كَسَبَتۡ أَيۡدِيكُمۡ وَيَعۡفُواْ عَن كَثِيرٖ﴾ [الشورى: ٣٠]، ﴿ظَهَرَ ٱلۡفَسَادُ فِي ٱلۡبَرِّ وَٱلۡبَحۡرِ بِمَا كَسَبَتۡ أَيۡدِي ٱلنَّاسِ﴾ [الروم: ٤١]، لەبەرئەوەی باش وایە پەنا بەرینە بەر داوای لێخۆشبوون و گەڕانەوە لە تاوانەکان و وشەی داوای لێخۆشبوون (أستغفر الله) لەسەر زمانمان بێت.

٧- یارمەتییەکی تر سەیرکردنی ئەوانەی لەخوار خۆتەوەن لە ڕوانگەی ژیان یاخود لاشە یا سامان یا...هتد، کە تۆ هێشتا زۆر باشتریت لەهەموو لایەنێك لەوانەوە تاوەکو ناخۆشییەکەت ئاسان بێت

وەك پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: «انْظُرُوا إِلَى مَنْ هُوَ أَسْفَلَ مِنْكُمْ»[١].

٨- کەمکردنەوەو دوورکەوتنەوە لەو شتانەی ئەبێتە هۆی کاری ئارام نەگرتن لەسەر ئەو کارە وەکو پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمان دەدات بەو گەنجانەی کە ناتوانن خێزان بهێنن بەڕۆژوو بن وەکو یارمەتییەك لەسەر گەنجیەتی.. خۆڕاگرتن.

٩- خۆپاراستن لە بزوێنەری داواکارییەکان کە سەیرکردنە (النظر) وەك دەگێڕنەوە: «الْنَّظَرُ سَهْمٌ مَسْمُومٌ مِنْ سِهَامِ إِبْلِيسْ»[٢].

**واتە:** سەیرکردن تیرێکە لە تیرە ژەهراوییەکانی شەیتان. چاوگرتن واتە قەڵای پاراستن، ماناکەی تەواوە بەڵام پلەکەی (ضعیف)ە، و (ابن القیم) باسی پلەکەی نەکردووە.

١٠- پاراوکردن و تێرکردنی دەروون لە حەڵاڵەکان وەکو بەدیل و گۆڕانکاری لە حەرامەکان دا لەبەرئەوەی هەرچییەك دەروونی ئادەمیزاد داوای بکات لە حەرام حەڵاڵی لەبەردەم دا هەیە.

١١- بیرکردنەوە لە زیانو خراپی حەرام وە تاوانەکەی لە ژیانی دونیادا بەسە بۆ دوورکەوتنەوە لە تاوانەکە ئەگەر بێتو بەهەشت و

---

(١) رواه البخاري (٦٤٧)، ومسلم (٥٢٤٢).

(٢) سلسلة الأحاديث الضعيفة للألباني (١٠٦٥).

دۆزەخیش نەبێت بەڵام چاوی ئارەزوو کوێرە، وەك (ئەبوبەکرو عوسمان) رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا نە ئارەقیان خواردوەتەوەو نە زیناشیان کردووە لەبەر زیان و ناشیرینی کارەکە لە ئەقلیەتی پاك دا.

١٢- بیرکردنەوە لە شێوازو وێنەی ڕاستەقینەی کارەکە کە هەموو دەروونێکی پاكو بەرز نەفرەتی لێدەکات و نایەوێت، وەك شاعیر دەڵێت:

| | |
|---|---|
| إذا كثر الذباب على طعام | رفعت يدي ونفسي تشتهيه |
| وتجتنب الأسود ورود ماء | إذا كاك الكلاب يلغن فيه |

واتە: ئەگەر مێش زۆر بوو لەسەر خواردنێك دەستی لەسەر هەڵدەگرم و دەروونم داوای دەکات. شێر دوور دەکەوێتەوە لە گۆماوێك کە سەگ ئاوی لێبخوات.

١٣- بەهێزکردنی لایەنە دینییەکە، واتە یارمەتییەك بۆ درووکەوتنەوە لە تاوان، پیاچوونەوەیەکی کارەکە بکات لەسەر ڕوانگەی دینەکەی تاوەکو بزانێت تا چ ڕادەیەك لێی دوور بکەوێتەوە، وە شێوازی پیاچوونەوەکان ئەمانەن:

أ) شەرمکردن لە خوای گەورە کە تاوان بکات وە فەرمانەکانی بشکێنێت لەگەڵ ئەوەش دا خوای گەورە ئەبیسێت و

ئەبینێت کارەکەی بە (حقیقي)، واتە هەست کردن بە چاودێری کردنی تەواوی خوایی، وە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَيۡكُمۡ رَقِيبٗا﴾ [النساء : ١].

واتە: بە دڵنیایی یەوە خوای پەروەردگار سەرپەرشتی کاری بەندەکانی دەکات، لە هەموو جوڵەو وەستان و نهێنی یەك و ئاشکرایەك و بارودۆخێك دا کە پێویستی بە چاودێری بێت و مایەی شەرم کردن بێت(١).

ب) نەکردنی کارێك خوا پێی خۆشە، ئەو کارە نەکەیت تۆ پشت هەڵدەکەیت لە خۆشەویستی خوا، لەگەڵ ئەوەش دا تۆ خۆشەویستی و خواناسی خوا دەردەبڕیت، وەکو ئیمامی (شافیعی) دەفەرموێت:

تعصي الإله وأنت تظهر حبه    هذا محال في القياس بديع
لو كان حبك صادقا لأطعته    إن المحب لمن يحب مطيع(٢)

واتە: تاوان ئەکەیت و خۆشەویستی خوا دەردەبڕیت ئەمە کارێکی نابەجێیە لە عەقڵ، ئەگەر خۆشەویستییەکەت ڕاست بوایە گوێڕایەڵێت

---

(١) تيسير الكريم الرحمن للسعدي ص١٦٣.

(٢) ديوان الشافعي ص٥٨.

دەکرد، وە خۆشەویست گوێڕایەڵیّ خۆشەویستییەتی.

ج) سەیری نیعمەت و بەخشندەکانی خوا بکە بەسەرتەوە ئایا یەکێك چاکەت لەگەڵ دا بکات شایستەیە پێچەوانەی ویستەکانی بجولێیتەوە؟ کەواتە پاداشتی چاکە هەر چاکەیە: ﴿هَلۡ جَزَآءُ ٱلۡإِحۡسَٰنِ إِلَّا ٱلۡإِحۡسَٰنُ﴾[الرحمن : ٦٠].

د) چاوەڕێکردن و ترساندن لە ئەنجامی کارە خراپەکانت کە هەمووی مایەی تورەبوون و تۆڵە سەندنەوەی پەروەردگارە لێت، کەواتە لە تورەو سزای خوایی خۆت بپارێزە: ﴿وَيُحَذِّرُكُمُ ٱللَّهُ نَفۡسَهُۥ﴾[آل عمران : ٢٨]، ﴿ٱتَّقُواْ رَبَّكُمُ﴾[النساء : ١].

هـ) ناوو نازناوی ناشیرین لێیان ئەنجامی کارە خراپەکان بەسە بۆ ئەوەی دووربکەویتەوە لە تاوان، لەبری ناوو نازناوی شیرین، وەك (متقي و مؤمن و محسن) گۆڕان بۆ (السارق و الفاجر و العاصي و الظالم) لە ئاین دا، وە ناوی چاك بۆ کەسێك چاك دەبێت.

و) لەگەڵنەبوون (ڕوو وەرچەرخان)ی پەروەدگار لەگەڵ ئەوکەسانەی تاوان دەکەن بەسە بۆ خراپی ئەنجامی کاری تاوان، هەروەك بە پێچەوانەوەیە لەگەڵ خواناسان: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلصَّٰبِرِينَ﴾

[البقرة : ١٥٣]، ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلَّذِينَ ٱتَّقَوا۟ وَّٱلَّذِينَ هُم مُّحْسِنُونَ ﴾ [النحل : ١٢٨]. **خوای پەروەردگار لەگەڵ ئارامگران و خواناسان و چاکە خوازاندایە.**

**سەرپەرشتی و پاراستنی تایبەتی بۆ کەسانی باوەڕدارو چاکەکاران، داماوی بۆ ئەو کەسەی کە خوای گەورە سەرپەرشتی ناکات و لەگەڵی دا نییە لە کارەکانی دا وە دەیداتەوە دەست دەروونی خۆی و شەیتان.**

**وە (ابن القيم) رَحِمَهُ ٱللَّهُ چۆنیەتی ئارامگرتن دەکات بە سێ بەشەوە لەبواری خواپەرستی و تەوحید دا:**

**١- الصبر بالله.**

**٢- الصبر لله.**

**٣- الصبر مع الله[(١)].**

**١- ئارامگرتن بەخوای گەورە: واتە پشت بەستن بەخوا لەسەر ئارامگرتن، ئەمە پەیوەندی بە (توحيد الربوبية)ەوە هەیە. (الصبر بالله).**

**٢- ئارامگرتن لەبەر خوا: ئەوەیە ئارام بگریت لەبەر ڕەزامەندی خوا، ئەمە پەیوەندی بە (توحيد الألوهية)ەوە هەیە. (الصبر لله).**

---

(١) مدارج السالكين جـ٢ ص ١٥٢.

٣- ئارامگرتن لەگەڵ خوادا: واتە ڕازی بوون و پەیوەست بوونی بەندەیەك بە یاساو فەرمان و مەبەستەكانی دینی خوادا (الإرادة الدينية)، وە ئارامگرتن بۆ بەجێهێنانی فەرمانی خوا بەهەموو شێوەیەك، وە لە هەموویان بەهێزتر ئارامگرتنە لەبەر خوا كە هەمووی دەبێتە مایەی خواپەرستی، بەڵام یەكەم داواكاریەو یارمەتییە، وە سێیەم تواناو ڕەزامەندی تۆی تێدا نییە، بەڵام دووەم ڕەزامەندی و تواناو داوای تۆی تێدایە بۆیە لە هەردوو بەشەكە بەرزترە. (الصبر مع الله).

كەواتە با هەموو ئارامگرتنێكمان بچێتەوە سەر خاڵی دووەم لەبەر خوای پەروەردگار بێت مایەی ڕەزامەندی ئەومان مەبەست بێت كە پەیوەندی بە (توحيد الألوهية)ەوە هەیە.

## هەندێك لە ئارامی پێغەمبەر ﷺ و یاوەرانی

ڕوون و ئاشكرایە كە چاكترین سەدەیەك كە ئادەمیزادی تیا ژیابێت سەدەی سەردەمی پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵانی بووە، لەبەرئەوە هەموو فەرمانەكانی خواو پێغەمبەریان تێدا بەڕێوە بردووە، هەر لە بچووكەوە هەتا گەورە لە هەموو ساتێك و كاتێك دا، لەبەرئەوە نمونایەتی بەڕێوەبردنی یاساو فەرمانەكانی ئیسلامیان دەكرد لەسەر زەوی.

وە ئێستاش چەند کاتو ژیانێکیان باس دەکەین کە هەریەکێکیان شاخێکی پۆلایین بوون بەرامبەر هەموو ئەو کاتە دڵتەزێن و سامناکانەی تووشیان بووە لە ژیانی ڕۆژانەیان دا.

**١-** وەك (عبداللە ی کوڕی مەسعود) ﵁ دەفەرموێ: چوومە لای پێغەمبەر ﷺ لەکاتی نەخۆشییەکەی دا تایەکی زۆر توندو تیژی هەبوو، وتم: ئەی پێغەمبەر تایەکی زۆرت هەیە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: «أَجَلْ، إِنِّي أُوعَكُ كَمَا يُوعَكُ رَجُلاَنِ مِنْكُمْ» قُلْتُ: ذَلِكَ أَنَّ لَكَ أَجْرَيْنِ؟ قَالَ: «أَجَلْ، ذَلِكَ كَذَلِكَ، مَا مِنْ مُسْلِمٍ يُصِيبُهُ أَذًى، شَوْكَةٌ فَمَا فَوْقَهَا، إِلَّا كَفَّرَ اللهُ بِهَا سَيِّئَاتِهِ، كَمَا تَحُطُّ الشَّجَرَةُ وَرَقَهَا»[1].

**واتە:** بەڵێ بەئەندازەی دووانی وەك ئێوە تام هەیە. وتم: دوو پاداشتت هەیە؟ فەرمووی: بەڵێ سوێند بەو کەسەی گیانی منی بەدەستە هەر مووسڵمانێك لەسەر زەوی دا... وە هەر ئێش و ئازارو نەخۆشییەکی تووش بێت خوای گەورە تاوانەکانی پێ لادەبات وەك چۆن گەڵا بە دارەوە دەوەرێت.

**٢-** وە دایکی موسوڵمانان (عائیشە) ﵂ دەفەرموێت: «مَا رَأَيْتُ الْوَجَعَ عَلَى أَحَدٍ أَشَدَّ مِنْهُ عَلَى رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ

(١) رواه البخاري (٥٦٤٨)، ومسلم (٢٥٧١).

وَسَلَّمَ»[١].

**واتە:** هیچ ئێش و ئازارێکی توندم نەبینیوە وەك ئێش و ئازارەکەی پێغەمبەر ﷺ.

**٣-** (ئوسامەی کوڕی زەید) دەفەرموێت ﵁: یەکێك لە کچەکانی پێغەمبەر ﷺ ناردی بەدوای پێغەمبەردا کە پێی بلێن منداڵێکم خەریکە دەمرێت!! پێغەمبەر فەرمووی: «ارْجِعْ إِلَيْهَا فَأَخْبِرْهَا أَنَّ للهِ مَا أَخَذَ وَلَهُ مَا أَعْطَى، وَكُلُّ شَيْءٍ عِنْدَهُ بِأَجَلٍ مُسَمًّى، فَمُرْهَا فَلْتَصْبِرْ وَلْتَحْتَسِبْ»، فَأَعَادَتِ الرَّسُولَ أَنَّهَا قَدْ أَقْسَمَتْ لَتَأْتِيَنَّهَا، فَقَامَ النَّبِيُّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَقَامَ مَعَهُ سَعْدُ بْنُ عُبَادَةَ، وَمُعَاذُ بْنُ جَبَلٍ، فَدُفِعَ الصَّبِيُّ إِلَيْهِ وَنَفْسُهُ تَقَعْقَعُ كَأَنَّهَا فِي شَنٍّ، فَفَاضَتْ عَيْنَاهُ، فَقَالَ لَهُ سَعْدٌ: يَا رَسُولَ اللهِ، مَا هَذَا؟ قَالَ: «هَذِهِ رَحْمَةٌ جَعَلَهَا اللهُ فِي قُلُوبِ عِبَادِهِ، وَإِنَّمَا يَرْحَمُ اللهُ مِنْ عِبَادِهِ الرُّحَمَاءَ»[٢].

**واتە:** سڵاوی منی پێبگەیەنن بلێن: خوای گەورە بەدەستی خۆیەتی

---

(١) رواه أحمد (٢٥٣٩٦)، والترمذي (٢٣٩٧)، والنسائي (٧٠٥٠)، وابن حبان (٢٩١٨)، وقال شعيب الأرنؤوط: إسناده صحيح على شرط الشيخين.

(٢) رواه البخاري (٥٦٥٥)، ومسلم (٩٢٣)، صحيح سنن النسائي للألباني (١٨٦٨).

ئەوەی کە دەیبەخشێت، وە هەموو کارێك لای خوا تا کاتی دیاریکراوی خۆیەتی، با ئارام بگرێت تا پاداشتی بداتەوە. بەڵام کچەکەی پێغەمبەر دووەمجار ناردیەوە بەدوای دا... پێغەمبەر ﷺ هەستا لەگەڵ سەعدی کوڕی عەبادەو موعازی کوڕی جەبەل و ئوبەی و زەید دا چوون بۆ ماڵی کچەکەی، لەوێ منداڵەکەی گرتە باوەشی و منداڵەکە هەر دەتلایەوە لەباوەشی دا، پێغەمبەر ﷺ فرمێسك بەچاوی دا هاتە خوارەوە. سەعد وتی: ئەمە چییە ئەی پێغەمبەر؟ (واتە بۆچی دەگریت)، لەگەڵ ئەوەش دا فەرمانت داوە بە نەگریان لەسەر مردوو؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەمە بەزەییە کە خوا دەیخاتە دڵی ئەو بەندانەی کە دەیەوێت، وە خوا بەزەیی دێتەوە بەو بەندانەی کە بەزەییان لە دڵدایە.

٤- (ئەنەسی کوڕی مالیك) رضي الله عنه بەسەرهاتێکی ترمان بۆ دەگێڕێتەوەو دەفەرموێت: بینیم (ئیبراهیمی کوڕی پێغەمبەر) ﷺ تەپاوتلی دەدا لە باوەشی پێغەمبەردا خەریك بوو گیانی دەردەچوو، چاوەکانی پێغەمبەر پڕ بووبوون لە فرمێسك و بەچاوی دا دەهاتە خوارەوە فەرمووی: «إِنَّ الـعَيْنَ تَدْمَعُ، وَالـقَلْبَ يَحْزَنُ، وَلاَ نَقُولُ إِلَّا مَا

يَرْضَى رَبُّنَا، وَإِنَّا بِفِرَاقِكَ يَا إِبْرَاهِيمُ لَمَحْزُونُونَ»[(١)].

واتە: چاو فرمێسك دەڕێژێت و دڵ بریندار و نارەحەت دەبێت و هیچ ناڵێین تەنها ئەوە نەبێت کە خوا پێی خۆش نەبێت، سوێند بەخوا ئەی ئیبراهیم ئێمە بە دووری تۆ دڵتەنگ و خەفەتبارین.

٥- وە (عبداللە ی کوڕی مەسعود) رضي الله عنه زۆر نەخۆش بوو هەندێك لە هاوەڵانی چوون بۆ سەردانی بینیان زۆر ناساغە وتی: «فَأَجَابَهَا بِصَوْتٍ ضَعِيفٍ بَلَغَتِ الْحَرَاقِفَ، وَطَالَتِ الضِّجْعَةُ وَاللهِ مَا يَسُرُّنِي أَنَّ اللهَ نَقَصَنِي مِنْهُ قُلَامَةَ ظُفُرٍ»[(٢)].

واتە: دەمێکە کەوتووم لە جێگاداو لەشم ووشك بۆتەوە، سوێند بە خوا حەز ناکەم خوا بە ئەندازەی سەرە نینۆکێك ئەم نەخۆشیەم لێ کەم بکاتەوە.

٦- وە (ئەبوبەکری سدیق) رضي الله عنه ناساغ بوو یاوەرەکان چوون بۆ لای پێیان وت با پزیشکێکت بۆ بانگ بکەین، ووتی: پزیشك منی بینیوە، وتیان: ئەی چی پێ وتی؟ فەرمووی: پێی وتم (إني فعال لما أريد)

(١) رواه البخاري (١٢١٩) ومسلم (٤٢٥٨)، وابن ماجه (١٥٧٧).

(٢) ابن أبي الدنيا في " المرض والكفارات " (١٩٧)، وابن المبارك في " الزهد " (٤٦٣)، وأحمد في " الزهد " ص٣٥٩.

لە ئایەتی: ﴿فَعَّالٌ لِّمَا يُرِيدُ﴾ [البروج: ١٦]، واتە ئەوەی بمەوێت دەیکەم[١].

٧- هەروەك (عورووەی کوڕی زوبێر) لەگەڵ کوڕەکەی دا (موحەمەد) چوون بۆلای خەلیفە (وەلیدی کوڕی عەبدولمەلیك)، (محەمەدی کوڕی عوروە) سیمایەکی جوانی هەبوو بە لاشەو هەیکەل بوو جلێکی جوانی لەبەرکردبوو، کاتێك (وەلید) ئەم کوڕەی بینی وتی: کوڕانی قوڕەیش جاران ئاوابوون. لەدوای ئەم قسەیە هاتنە دەرەوەو کوڕەکەی بە چاوییەوە بوو تاکو مرد، وە قاچی (عورووە)ی باوکیشی تووشی خۆرە بوو، وتیان: ئەگەر نەیبڕیتەوە ئەیداتە هەموو لەشت، ئەویش وتی: بیبڕنەوە، وتیان: شتێکت نەدەینێ تا هەست نەکەیت بە ئازار؟ وتی: نەخێر بەڵکو خوا ئەمەی داوە بەسەرما تا بیبینێت ڕادەی ئارامگرتنم. کاتێك مشاریان خستە سەرقاچی دەستیان کرد بەبڕینەوە و بورایەوە، دوایی هاتەوە سەرخۆی و قاچەکەی کە بڕییانەوە هەڵیگرتو وتی: ئەی قاچەکە من تا ئێستا سوێند بەخوا بەتۆوە نەچووم بۆ هیچ حەرامێك و تاوانێك تەنانەت بۆ ئەوەی کە خوا پێی ناخۆشە، دوای ئەوە فەرمانی دا بنێژرێت، لەدوای ئەمانە گەڕایەوە بۆ شاری مەدینە هەر خۆی، خزم وکەس وکارەکانی ئەهاتن بۆ لای

---

(١) أحمد في " الزهد " ص٥٨٨، وابن السعد في " الطبقات " (٣/ ١٩٨)، وابن أبي شيبة في " المصنف " (١٣/ ٢٦٢).

سەرەخۆشیان لێ ئەکرد، ئەویش ئەم ئایەتەی دەخوێندەوە: ﴿لَقَدْ لَقِينَا مِن سَفَرِنَا هَٰذَا نَصَبًا﴾ [الكهف: ٦٢] [١].

٨- پێغەمبەر ﷺ زۆر هیلاك بوو لەو نەخۆشییەدا کە کۆچی دوایی کرد، (فاتمەی) کچی هاتە ژوورەوە بۆلای و گریا بە دەنگی بەرزو وتی: ئای چەندە باوکم لە هیلاکییەکی زۆردایە! پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: «لَيْسَ عَلَى أَبِيكَ كَرْبٌ بَعْدَ الْيَوْمِ»[٢].

**واتە:** لەمڕۆ بەدواوە لە هیلاکی دا نامێنم.

دوای ئەوەی پێغەمبەر ﷺ کۆچی دوایی کرد ناشتیان، (فاتمە) چووە ئەو ژوورەی کە پێغەمبەریان تیا ناشت و ڕووی کردە (ئەنەس) و وتی: چۆن دڵتان ڕێگە دەدات خۆڵ بکەن بەسەر پێغەمبەری خوادا؟! (ئەنەس) وتی: سوێند بە خوا بەدەست ئەیکەین‌و دڵمان دژایەتیمان دەکات، ئەو کاتە (فاتمە) ﵂ چنگێك خۆڵی لەسەر گۆڕی پێغەمبەر ﷺ هەڵگرت و ئەم شیعرەی وت:

---

(١) ابن أبي الدنيا في " المرض والكفارات " (١٣٩-١٤١)، و" تأريخ دمشق " (١١/ ٢٨٦)، و" سير الأعلام " للذهبي (٤/ ٤٣٠)، وفي " الحلية " لأبي نعيم (٢/ ١٧٨).

(٢) رواه البخاري (٤١٠١)، وأحمد (٣/ ١٩٧).

ماذا على من شم تربة أحمد ألا يشم مدى الزمان غواليا
صبت علي المصائب لو أنها صبت على الأيام عدن لياليا[(١)]

واته: ئەبێت حاڵی ئەو کەسە چی بێت کە تا ئێستا بۆنی خۆڵی سەرگۆڕی پێغەمبەری ﷺ بەسەردا نەهاتووە، بەڵایەك بەسەر من دا ڕژاوە ئەگەر بێتو بەسەر ڕۆژان دا بڕژایە ئەبوو بە شەو.

٩- کاتێك (ئەبو دەرداء) نەخۆش کەوت هاوەڵەکانی چوون بۆلای بۆماڵەوە وتیان: چ نەخۆشییەکت هەیە؟ وتی: نەخۆشی تاوان و گوناهمە (واتە ئەمەوێت بەم نەخۆشییە تاوانەکانم لابچێت)، وتیان حەز لەچی دەکەیت؟ وتی: حەز لە بەهەشت دەکەم، وتیان: ئەی پزیشکت بۆ بانگ نەکەین؟ وتی: ئەو منی خستووە لە جێگەدا[(٢)].

بەو شێوەیە هاوەڵەکان هەموو دەم حەزیان کردووە ئەوەی کە خوا پێی خۆشە تووشیان بێت.

١٠-کاتێك (زەیدو جەعفەرو عبدالله ی کوڕی ڕەواحە) شەهیدکران پێغەمبەر ﷺ دەستی بەرزکردەوەو داوای لێخۆشبوونی بۆ ئەکردن فرمێسك بە هەردوو چاوی دا ئەهاتە خوارەوە دوای ئەوە

---

(١) رواه البخاري (٤١٠١).

(٢) أحمد في " الزهد " (٧١٧)، أبو نعيم في " الحلية " (١/ ٢١٨)، والنسائي (١٨٨٤).

چوو بۆ ماڵی هەریەك لەوانە كاتێك چووە ماڵی (زەیدی كوڕی حاریسە) كچە بچكۆلەكەی بە قوڕگی پڕ لە گریانەوە خۆی خستە باوەشی پێغەمبەر ﷺ وە پێغەمبەریش دڵی پڕبوو گریا[١].

١١- (ئوسامەی كوڕی زەید) ؓ دەفەرموێت: كاتێك باوكم شەهید بوو لە شەڕی مۆتە چووم بۆلای پێغەمبەر، كە منی بینی فرمێسك بەچاوی دا هاتە خوارەوە[٢].

١٢-هەروەها (عبداللە ی كوڕی ئەبوبەكر) ؓ لە جەنگی (تائیف)دا تیرێكی بەركەوت شەهید بوو، ئەمە بە چل ڕۆژ دوای كۆچی دوایی پێغەمبەر ﷺ ڕووی دا، (ئەبوبەكری سدیق) ؓ دوای ئەوە چوو بۆ لای (عائیشە) ؓ و وتی: ئەی كچم سوێند بە خوا هەروەك گوێی مەڕێك بگرم و لە ماڵ بیبەمە دەری (دیارە عائیشە ؓ خەفەتی ئەخوارد)، وە وتی: ئەی كچم ئێوە ئەترسن (عبداللە)م بە زیندوویی خستبێتە گۆڕ، ئەویش وتی: ئەی باوكە ﴿إِنَّا لِلَّهِ وَإِنَّآ إِلَيۡهِ رَٰجِعُونَ﴾. كاتێك نوێنەری (ثقیف) هاتن بۆ لای خەلیفە

---

(١) رواه البخاري (١١٦٨)، ومسلم (١/ ٧٠)، والنسائي (٢١٧)، حياة الصحابة جـ٣ص١٦٩.

(٢) رواه ابن أبي شيبة في مصنفه (١٢/ ١٣٨).

(ئەبوبەکری سدیق) ئەویش چوو ئەو تیرەی (عبداللە)ی کوڕی پێ شەهید کرابوو هێنای و وتی: خاوەنی ئەم تیرە ئەناسنەوە کێیە؟! دوای تێڕوانین یەکێکیان وتی: ئەم تیرە بە دەستی من دروستکراوەو هاوێژراوە لـە شەڕدا. (ئەبوبەکر) ﷺ فەرمووی: ئەم تیرە بوو (عبداللە ی کوڕی ئەبوبەکر)ی کوشت، سوپاس بۆ خوا کە لـەسەر دەستی تۆدا شەهید بوو، وە بەدەستی ئەو تۆ نەکوژرای لـەسەر بێباوەڕی تا ڕووڕەش بیت لای خوا[1].

**١٣**–هەروەها ڕۆژێك بە (ئەبو زەر)یان ووت: تۆ هیچ منداڵت بۆ نامێنیت (وەك کەم وکوڕییەك دایانە پاڵی)، ئەویش وتی: سوپاس بۆ ئەو خوایە لـە دونیا لـێمدەستێنێت و لـە ڕۆژی دوایی بۆم کۆدەکاتەوە[2].

**١٤**–وە هەروەها کاتێك (حەمزە) ﷺ شەهید کرا، مامی پێغەمبەر ﷺ لـە جەنگی (ئوحود) دا، پێغەمبەر ﷺ چووە سەری و بینی لـەشیان پارچە پارچە کردووە، بەشێوەی (هەتك کردن) پێغەمبەری خوا ﷺ مامی بینی بەم شێوەیە ئارامی گرت و بینی ئافرەتێك بەرەو ڕووی شەهیدەکان ڕادەکات فەرمووی: ئەو ئافرەتە.. ئەو ئافرەتە. پێی

(١) رواه البيهقي في " الكبرى " (٩/ ٩٨)، والحاكم في " المستدرك " (٣/ ٤٧٧).

(٢) حياة الصحابة جـ٣ص٣٨١، وكنز العمال (٨٦٨٢).

ناخۆش بوو بەو شێوەیە بیانبینێت، (زوبەیری کوڕی عەوام) وتی: زانیم ئەو ئافرەتە دایکمە (صفیة)یە وە پوری پێغەمبەر ﷺ بوو بەرەو ڕووی ڕامکردو پالّم پێوەنا نەمدەهێشت، ئەویش هەر هەولّی ئەدا تا بچێتە مەیدانی جەنگەوە تا وتم: ئەی دایکە پێغەمبەر فەرمانی داوە نەهێلّین و بتگێڕینەوە، ئینجا وەستاو دوو پارچە قوماشی دەرکردو وتی: دەباشە بەم دوو پارچە کفنی حەمزەی برام بکەن بیستوومە کە شەهید کراوە بەلاّم ئارام دەگرم[1].

١٥-(عەبدولّلاّی کوڕی مەسعود) رضي الله عنه کاتێك کە بیستی بەکۆچی دوایی (عوتبە)ی برای فرمێسك بەچاوی دا هاتە خوارەوەو پێیان وت: ئەوە ئەگریت؟ ئەویش وتی: ئەوە بەزەییەکە خوا خستوویەتییە دلّی بەندەکانیەوە، وە ئادەمیزاد هیچ تواناو دەسەلاّتی بەسەردا نییە، وە (عوتبە) لەگەلّ ئەوەش دا برام بوو هاوڕێی ئیسلامم بوو حەزم دەکرد من لەپێش ئەودا بمرم تا ئەو ئارامی بگرتایە پاداشتی بدرایەتەوە لەسەر من[2].

١٦-وە دایکی موسولّمانان (زەینەبی کچی جەحش) کاتێ کۆچی

---

(١) أخرجه الحاكم في " المستدرك " (٣/ ١٩٧)، وأحمد (١٤١٨) سنده حسن، والبيهقي (٤٠١٣) بسند صحيح، وحياة الصحابة جـ٣ ص١١٧٥.

(٢) أبو نعيم في " الحلية " (٤/ ٢٥٣)، وابن سعد في " الطبقات " (٤/ ١٢٧).

دوایی کرد برایەکی کوێری هەبوو پێیان دەوت: (باوکی ئەحمەد)، سەرینەکەی (زەینەب)ی خوشکی گرتبووە باوەش و ئەگریا، (عومەری کوڕی خەتاب) ﵁ فەرمووی: ئەی باوکی ئەحمەد سەرینەکە دابنێ هیچ سودت پێناگەیەنێت، وتی: ئەی عومەر ئەمە تەسکینیم پێدەگەیەنێت و گەرمایی دڵم سارد دەکاتەوە، عومەر فەرمووی: بیگرە... بیگرە[1].

١٧- کاتێ (عومەری کوڕی خەتاب) ﵁ بریندار کرا پێش ئەوەی کۆچ بکات فەرمووی: ئەگەر مردم نانو خواردن بۆ ئەو خەڵکە ئامادە بکەن و بەڕێیان کەن. لەدوای ئەوەی وەفاتی کردو ناشتیان و گەڕانەوە بۆ ماڵەوە خواردن ئامادەکراو هاوەڵەکان هەموویان دانیشتن، بەڵام هیچیان بۆ نەدەخورا لە خەفەت دا، (عەباس)ی مامی پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەی خەڵکینە پێغەمبەر ﷺ کۆچی دوایی کرد لەدوای ئەو خواردمان و خواردمانەوە وە (ئەبوبەکر) کۆچی دوایی کرد لەدوای ئەویش دەستمان کردەوە بە خواردن و خواردنەوە ئەبێت هەر بخۆین. ئیتر (عەباس) دەستی ڕاکێشا بۆ خواردنەکەو موسوڵمانانیش دەستیان ڕاکێشا[2].

---

(١) ابن سعد في " الطبقات " (٨/ ١١٣).

(٢) ابن سعد في " الطبقات " (٤/ ٢٩)، مجمع الزوائد (٥/ ١٩٦).

**١٨**–وە (عەلی کوڕی ئەبوتالیب) ﷺ سەرخۆشی لە (ئەشعەسی کوڕی قەیس) کرد کە کوڕەکەی مردبوو فەرمووی: ئەم قەدەرەت بەسەردا هاتووە ئەگەر ئارام بگریت خوا پاداشتت دەداتەوە، وە ئەگەر ئارام نەگریت و بگریت و هاوار بکەیت ئەوا تاوانبار ئەبیت و لەگەڵ ئەوەش دا کە هەر هاتووە بەسەرت داو ناگەڕێتەوە.

**١٩**–ڕۆژێك ئیمامی (عومەر) ﷺ و چەند هاوەڵێکی مردوویەکیان ئەبرد بۆ گۆڕستان، لایەکی نەعلەکەی پێی ئیمامی (عومەر) پچڕا ئەویش فەرمووی: ﴿إِنَّا لِلَّهِ وَإِنَّآ إِلَيۡهِ رَٰجِعُونَ﴾. وتیان: ئەی خەلیفە ئەوەت وت بۆ پچڕاندنی نەعلێك؟! فەرمووی: بەڵێ هەرشتێك موسوڵمان تووشی بێت و پێی ناخۆش بێت ئەوە بەڵایە (مصیبة) وە لەکاتی بەڵادا ئەبێت ئەوە بوترێت.

بەم شێوەیە ئارامی هاوەڵەکان شاخێکی پۆڵایین بوون بەرامبەر بای تاریکی خەم و خەفەت، نەك هەر پیاوان بەڵکو ئافرەتانیش بەهەمان شێوە بوون وەك لەمەوپێش هەندێکمان باس کرد وە ئێستاش هەندێکی تر لە ئارامییان باس دەکەین:

**٢٠**–(عەبدوڵڵای کوڕی عەباس) ﷺ بە (عطاء)ی وت: ئەتەوێت ئافرەتێکی بەهەشتیت پیشان بدەم؟ دەستی بۆ ئافرەتێکی ڕەش ڕاکێشاو وتی: ئەو ئافرەتە ڕەشەیە، هات بۆ لای پێغەمبەر ﷺ وتی: من

ئەبورێمەوەو خۆم ڕووت دەکەمەوە (نەخۆشی پەرکەمی هەبوو) بۆم بپارێرەوە لای خوا لەسەرم لابدات، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەگەر ئارام بگریت ئەوە پاداشتت بەهەشتە، وە ئەگەر دەتەوێت داوا دەکەم لەخوا لەسەرت لابدات؟! ئافرەتەکە وتی: ئارام دەگرم قەیناکا بەلام دوعام بۆ بکە خۆم ڕووت نەکەمەوە، پێغەمبەریش ﷺ دوعای بۆ کرد وە لەدوای ئەو دوعایە خۆی ڕووت نەدەکردەوە[1]. بوخاری ئەفەرموێت (عطاء) وتی: ئەو ئافرەتە ڕەشە دایکی ئیمامی (زوفەر) بوو کە قوتابی (ئەبوحەنیفە) بووە.

**٢١**-هەروەها لە جەنگی بەدردا (حارسی کوڕی سوراقە) تیرێکی بەرکەوت شەهید بوو لەدوای جەنگەکە دایکی هات بۆلای پێغەمبەر ﷺ و وتی: ئەی پێغەمبەر هەواڵم بدەرێ حارسەی کوڕم ئەگەر لە بەهەشت دایە با ئارام بگرم و پێی دڵخۆش بم وە ئەگەر لە بەهەشتیش نییە با دەست بکەم بە خۆکوشتن و گریان (هێشتا لەم کاتەدا خۆکوشتن لەسەر مردوو حەرام نەبووبوو)، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئایا تێکچوویت؟ خۆ یەك بەهەشت نییە چەندەها بەهەشتە کوڕەکەی تۆ لە بەرزترین پلەی بەهەشتە (فیردەوس)، دایکی کە ئەمەی بیست

---

(١) رواه البخاري (٥٣٤١)، ومسلم (٤٦٥١).

وتی: ئارام دەگرم وە بە پێکەنینەوە لەخۆشی دا گەڕایەوە[(١)].

٢٢–وە کاتێك (عوسمانی کوڕی مضعون) کۆچی دوایی کرد پێغەمبەر ﷺ ناوچاوی ماچ کردو فرمێسك بە چاوەکانی دا دەهاتە خوارەوە تا وای لێهات ئەکەوتە سەر ڕوومەتی عوسمان[(٢)].

٢٣–ئافرەتێکی باوەڕدار کە ناوی (دایکی سەلیم) بوو ڕۆژێك هاتەوە بۆلای مێردەکەی کە موسڵمان نەبووبوو هەموو جارێك هەواڵێکی بۆ ئەهێنا، ڕۆژێك هاتەوە وتی: هەواڵێکم بۆ هێناوی، مێردەکەشی وتی: هەموو جارێك هەواڵێکی ناسازم بۆ دەهێنیتەوە لای ئەو کابرایە (مەبەستی پێغەمبەر بوو) دوایی وتی: دەی بزانم هەواڵی چیت پێیە؟! (دایکی سەلیم) وتی: عەرەق حەرام بووە، مێردەکەشی وتی: ئائەمە جیاوازییە لە نێوان من و تۆداو مرد بە بێباوەڕی، دوای ماوەیەك (ئەبو تەڵحە) چوو بۆ داوای شووی پێبکات، (دایکی سەلیم) وتی: من چۆن شوو دەکەم بەتۆ کە تۆ پیاوێکی بێبڕوای، وە تەختەیەك دەپەرستی کە بەندەکەم پیسایی لا دەکات، (ئەبو تەڵحە) وتی: نەخێر مەبەستت ئەوە نییە (واتە مەبەستت موسوڵمان نەبوونی من نییە)، ئەویش وتی: ئەی مەبەستم چییە؟ وتی: مەبەستت ئاڵتوون و زیوە،

---

(١) رواه الترمذي (١٢٤١)، وفي " الصحيحة " (١٨١١، ٢٠٠٣).

(٢) رواه الترمذي (٩٨٩)، وأبو داود (٣١٦٣)، وابن ماجه (١٤٠٦).

(دایکی سەلیم) وتی: تۆ گەواهی بدە لەگەڵ پێغەمبەردا ئەگەر موسڵمان بیت شووت پێدەکەم وە مارەییەکەم موسوڵمان بوونت بێت، وتی: ئەی چۆن بچم بۆلای پێغەمبەر؟ ئەڵێت کاتێك نزیك بووینەوە لە پێغەمبەر ﷺ گوێی لە قسەکانمان بوو فەرمووی: ئەوە (ئەبو تەڵحەیە) لەنێوان هەردوو چاوی دا موسوڵمان بوونی تیا دیارە، گەیشتە لای پێغەمبەر ﷺ و سڵاوی کردو وتی باوەڕم هەیە کە هیچ خوایەك نییە بێجگە لە (الله)، وە (موحەممەد)یش بەندەو نێردراوی خوایە، موسڵمان بوو، وە پێغەمبەر (دایکی سەلیم)ی لێ مارە کرد لەسەر ئیسلام بوونی، وە منداڵێکیان بوو زۆری خۆش دەویست ئاواتی زۆری پێ بوو، منالەکە نەخۆش کەوت (ئەبوتەڵحە)ش چوو بوو بۆ سەفەر کاتێك گەڕایەوە منداڵەکە مرد، (دایکی سەلیم) هەستا منداڵەکەی لە سووچێکیماڵەکەدا دانا سەری داپۆشی، کاتێك (ئەبوتەڵحە) گەڕایەوە (دایکی سەلیم) پێی وت: ئەمڕۆ خواردنت دواکەوت، یان خواردنت بۆ بێنم؟ ئەویش پرسیاری منداڵەکەی کردو وتی: چۆنە؟! (دایکی سەلیم) وتی: ئێستا بێدەنگ بووە بەڵکو بحەسێتەوە، نانی خواردو شەو داهات و بەجوانترین شێوە خۆی بۆ ڕازاندەوە ئەوسا هەواڵی دایەو پێی وت: ئەی (ئەبو تەڵحە) ئەگەر یەکێك شتێکی بە ئەمانەت هێناو ماوەیەك لات بوو دوای ئەوە

خاوەنەکەی بردییەوە ئایا پێویست دەکات دڵگران بیت و پێت ناخۆش بێت؟ وتی: نەخێر، دوای ئەوە وتی: کوڕەکەت خوا بردییەوە بۆلای خۆی و مردووە، پرسیاری لێکرد: لەکوێیە؟ وتی: ئەوەتا لەو سوچەدا دام پۆشیوە، کاتێکی بینی مردووە وتی: ﴿إِنَّا لِلَّهِ وَإِنَّآ إِلَيۡهِ رَٰجِعُونَ﴾. دوای ئەوە چوو بۆ مزگەوت و دوای نوێژی بەیانی هەواڵی دا بە پێغەمبەر ﷺ ئەویش فەرمووی: خوا بەرەکەت بخاتە ئەم شەوەتانەوە، لەدوای ئەمە خوا منداڵێکی پێ بەخشین، (ئەنەس) ئەم هەواڵەی گەیاند بە پێغەمبەر ﷺ وە فەرمووی: ئەی ئەنەس بڕۆ بۆلای دایکت پێی بڵێ خوا بەرەکەت داری کا، وە ببێت بە خواناسێکی خێروەمەند، وە پێی بڵێ هیچی لێ نەکات هەتا دێم ئەویش ناوکی بڕی و داینا هەتا پێغەمبەر ﷺ هات، کاتێك پێغەمبەر هات خستییە باوەشی و فەرمووی هیچی لەگەڵدایە؟ وتی: بەڵێ چەند خورمایەکی لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ دەنکێ لە خورماکانی دەرکردو کردییە دەمی منداڵەکەو دەمی شیرین کردو منداڵەکەش دەمی دەجوڵاند بەدوای شیرینییەکەدا، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەنصاری (واتە خەڵکی مەدینە) حەز لە خورما دەکەن، دوای ئەمە ناوی نا (عبدالله)، وە (سوفیان) دەڵێت: لە نەوەی ئەم کوڕە نۆ کوڕم بینی هەموویان قورئانیان ئەخوێند دوعاکەی

پێغەمبەر ﷺ هاتە دی بۆیان نەوەیەکی زۆرو هەموویان باوەڕدارو خواناس ئەمەش بە بۆنەی ئارامگرتنی دایکی سەلیمەوە[١].

**٢٤**- کاتێك نەخۆشی تاعون بڵاو بووەوە لە شام (ئەبو عوبەیدە) وتارێکی پێشکەش کردو وتی: ئەی خەڵکینە ئەم نەخۆشییە ڕەحمەتێکە بۆمان وە دوعای پێغەمبەرە (واتە داوای کردووە نەخۆشیمان تووش ببێت تاکو لە تاوانەکانمان پاك ببینەوە)، وە مردنی پیاوچاکانە لەپێش ئێوەدا وە (ئەبو عوبەیدە)ش داوا دەکات ئەم نەخۆشییە بەشی (ئەبوعوبەیدە)ی تیا بێت، دوای ئەمە تووشی بوو کۆچی دوایی کرد، دوای ئەمە (مەعاز) بوو بە پێشەوای موسوڵمانان بەهەمان شێوە وتاری پێشکەش کردو وتی: خوایە بەشی مەعازی تیابێت، لەدوای ئەمە دوو کچی تاعون لێی دان و مردن دەستبەجێ دوای ئەمە کوڕەکەی (عبدالرحمن) تووشی هەمان نەخۆشی بوو، کاتێ (مەعاز) لە مزگەوت گەڕایەوە وتی: ئەی (عبدالرحمن) چۆنی؟ وتی: ئەی باوکە ﴿ٱلْحَقُّ مِن رَّبِّكَ ۖ فَلَا تَكُونَنَّ مِنَ ٱلْمُمْتَرِينَ﴾ [البقرة : ١٤٧] لایەنی خوایەو دڵگران مەبن مەبەستی بەمە بوو، وە باوکی وتی: ﴿سَتَجِدُنِىٓ إِن شَآءَ ٱللَّهُ مِنَ

---

(١) رواه البخاري (٢/ ٨٢٢)، ومسلم (٣/ ٤٠)، وأحمد (١٥٥، ٢٨٧، ٢٩٠)، و" أحكام الجنائز " للألباني ص٢٦.

ٱلصَّـٰبِرِينَ ﴾ [الصافات : ١٠٢] وە بە ئیزنی خوا ئێمەش ئارام دەگرین، ئەو شەوە (عبدالرحمن) کۆچی دوایی کرد بە تاعون و بەیانی ناشتیان، دوای ئەوە (مەعاز) داوای کرد لە خوا کە خۆیشی تووشی بێت، تاعون دای لە دەستی هەموو جار سەیری ئەکردو ئەیوت ئەمەم لەهەموو شتێك بەلاوە خۆشەویستترە، یەکێك لای (مەعاز) ئەگریا پرسیاری لێکرد بۆ ئەگریت؟ وتی: لەبەرئەوە ئەگریم تۆ بمریت زانست و زانیاری یەکی زۆرت لەگەڵ دەڕوات، وتی: ئەگەر من مردم بڕۆن بۆ لای چوار کەس بۆ زانست و زانیاری: (عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود، عەبدوڵڵای کوڕی سەلام، سەلمانی فارسی، ئەبو دەرداء)، دوای ماوەیەك وەفاتی کرد بە نەخۆشی تاعون[1].

هەزاران هەزار دروودو سڵاو لە گیانی پاکی بەرزی بێت و جێگەی فیردەوسی بەرین بێت، اللهم آمین.

---

(١) تأريخ الطبري (٤/ ٦١)، أبو نعيم في " الحلية " (١/ ٢٤٠)، والحاكم (١/ ٢٧٦)، وأحمد (٤/ ١٩٥)، والبزار في " كشف الأستار " (٣٠٤٢)، و" مجمع الزوائد " للهيثمي (٢/ ٣١٢).

## چۆنیەتی ئارامگرتن لەکاتی بەڵادا و گریان لەسەر مردوو

گریان لەسەر مردوو پێغەمبەر ﷺ قەدەغەی نەکردووە بەمەرجێك قڕ ڕنینەوەو هاوارکردن و لاواندنەوەی تێدا نەبێت، کە ئەمانە هەمووی پێغەمبەری خوا بە کردەوەی سەردەمی نەفامی (جاهلیة) ناوی بردووە، وە پێویستە لەسەر هەموو موسڵمانێك دوور کەوێتەوە لەو کردەوانەی کە تاوانبار دەبێت لەسەری و بەتایبەتی گریان لەسەر مردوو کە مردووەکەش ئازاری پێ ئەچێژێت بەو بۆنەیەوە، وە بەچەند فەرموودەیەکی پێغەمبەر ﷺ ئەم باسە شیتەڵ دەکەینەوە:

١- وەك (جابری کوڕی عبدالله) ﷺ دەفەرموێت: کاتێك باوکم شەهید بوو لە جەنگی (ئوحود)دا من گریام، هاوەڵەکان پێیان ئەوتم مەگریە بەڵام پێغەمبەر هیچی نەدەفەرموو، وە پورە (فاتیمە)م دەگریا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: «تَبْكِينَ أَوْ لاَ تَبْكِينَ مَا زَالَتِ المَلاَئِكَةُ تُظِلُّهُ بِأَجْنِحَتِهَا حَتَّى رَفَعْتُمُوهُ»[1].

واتە: بگرین و نەگرین بەردەوام فریشتەکان بەباڵیان سێبەری بۆ دەکەن هەتا بەرزی دەکەنەوە.

---

(١) رواه البخاري (١٢٤٤)، ومسلم (٢٤٧١)، والنسائي، وأحمد (٣/ ٢٩٨)،وفي " أحكام الجنائز " للألباني ص٢٠.

٢- (عبدالله ی کوڕی عومەر) رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا ئەڵێت: (سەعدی کوڕی عەبادە) ناساغ بوو لەماڵەوە، (پێغەمبەر و عبدالرحمن ی کوڕی عەوف و سەعدی کوڕی ئەبی وەقاس و عبدالله ی کوڕی مەسعود) کاتێ چوونە ژوورەوە بۆلای بینیان بوراوەتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: کۆچی کردووە؟ وتیان: نەخێر، پێغەمبەری خوا ﷺ بەو شێوەیە بینی دەستی کردە گریان و هاوەڵەکان بینیان پێغەمبەر گریا ئەوانیش گریان، وە فەرمووی: «أَلاَ تَسْمَعُونَ إِنَّ اللَّهَ لاَ يُعَذِّبُ بِدَمْعِ العَيْنِ، وَلاَ بِحُزْنِ القَلْبِ، وَلَكِنْ يُعَذِّبُ بِهَذَا - وَأَشَارَ إِلَى لِسَانِهِ - أَوْ يَرْحَمُ»[1].

**واتە:** ئەی نەتانبیستووە کە خوا بە فرمێسکی چاو و خەفەتی دڵ کەس ئازار و سزا نادات! وە دەستی ڕاکێشا بۆ زمانی و فەرمووی: بەڵام بەمە ئازاری ئەدات، لەبەر ئەوە لاواندنەوە و هاوارکردن و قیژاندن هەر بە زمان دەکرێت.

٣- وە لەو کاتەدا (ڕوقیە)ی کچی پێغەمبەر ﷺ کۆچی کرد ئافرەتەکانی چواردەوری ئەگریان، وە (عومەری کوڕی خەتاب)یش بێدەنگی ئەکردن، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: «دَعْهُنَّ يَا عُمَرُ»، وَقَالَ:

---

(١) رواه البخاري (١٣٠٤)، ومسلم (٩٢٤).

«وَإِيَّاكُنَّ وَنَعِيقَ الشَّيْطَانِ»[(١)].

واتە: وازیان لێ بێنە ئەی عومەر با بگرین بەڵام ئاگایان لەخۆیان بێت نەقیژێنن و هاوار نەکەن وەك هاواری شەیتان.

هەروەك لە شوێنێکی تردا دەفەرموێت: «فَإِنَّهُ مَهْمَا يَكُونُ مِنَ الْعَيْنِ وَالْقَلْبِ فَمِنَ الرَّحْمَةِ، وَمَا يَكُونُ مِنَ اللِّسَانِ وَالْيَدِ فَمِنَ الشَّيْطَانِ»[(٢)].

واتە: گریان هەتا بە فرمێسك و بە خەفەتی دڵ بێت ئەوە لە لایەن خواوەیە، وە لە بەزەیی و ڕەحمەوەیە، وە ئەگەر لە لایەن دەست و زمانەوە بێت لە لایەن شەیتانەوەیە. واتە ئەگەر گریان دوور بێت لە قژ ڕنینەوە و خۆڵ کردن بەسەردا و قیژاندن و هاوارکردن و یەخە دادڕین ئەوە تاوانبار نابێت لەسەری، وە ئەگەر بە پێچەوانەوەی ئەمانەوە بوو ئەوا تاوانبار دەبێت وە هەر ئەمانەشە بە دەست و زمان دەکرێت.

٤- هەروەها لە مردنی (ئیبراهیم) دا بە پێغەمبەریان فەرموو: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ تۆ فەرمانت نەداوە کە نەگرین؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: «وَلَكِنْ نُهِيتُ ... وَصَوْتٍ عِنْدَ مُصِيبَةٍ لَطْمِ وُجُوهٍ وَشَقِّ

(١) تأريخ المدينة لإبن أبي شيبة جـ١ص١٠٢، وفي مسند للأبي داو الطيالسي جـ٤ص٤١١.

(٢) رواه أحمد (١/ ٢٣٧)، وحسنه سليم الهلالي في " تحقيق عدة الصابرين " ص١٦٦.

جُيُوبٍ ...»[١].

**واتە:** نەخێر بەڵكو فەرمانم داوە بە نەكردنی دەم و چاو رِنینەوە و یەخەدادڕین و هاواركردن.

وە لەم بارەیەوە چەند رِووداوێك باس دەكەین كە پێغەمبەری خوا ﷺ تیایان دا گریاوە:

١- وەك لە ساڵی هەشتی كۆچی دا كاتێ مەككەیان گرتەوە و چووە سەر گۆڕی دایكی و گریا[٢].

٢- وە هەر لەو ساڵەدا گریا لەسەر (زەینەب)ی كچی كاتێ كۆچی دوایی كرد[٣].

٣- وە هەر لەو ساڵەدا كاتێك (زەید و جەعفەر و عبداللە ی كوڕی رِەواحە) شەهید بوون دەستی بەرزكردەوە بۆیان و یەكە یەكە ناوی دەبردن و دوعای خێری بۆ دەكردن و فرمێسك بەچاوی دا ئەهاتە خوارەوە[٤].

٤- هەروەها گریا بۆ مردنی (سەعدی كوڕی مەعاز) رضي الله عنه لە

---

(١) الترمذي (١٠٠٥)، وابن ماجه (١٥٨٤)، والنسائي (١٨٦٢).

(٢) رواه مسلم (١٠٨).

(٣) رواه البخاري (١٢٨٥).

(٤) رواه مسلم (١٢٤٦).

ساڵی پێنجەمی کۆچی دا[١].

٥- وە کاتێك چووە سەر (عوسمانی کوڕی مضعون) بینی کۆچی کردووە ناوچاوی ماچ کردو فرمێسك بە چاویا ئەهاتە خوارەوە ئەوەندە گریا هەتا فرمێسکەکان ئەکەوتنە سەر ڕوومەتی عوسمان[٢].

٦- (ئەبوبەکری سدیق) ﵁ گریا لەسەر پێغەمبەر ﷺ کاتێ کۆچی دوایی کرد[٣].

٧- وە گریان بەدەنگی بەرزو هەڵدان بەسەر مردوودا مردووەکە سزا دەدرێت لە گۆڕدا، وەك پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: «لَيْسَ مِنَّا مَنْ لَطَمَ الْخُدُودَ، وَشَقَّ الْجُيُوبَ، وَدَعَا بِدُعَاءِ أَهْلِ الْجَاهِلِيَّةِ»[٤].

واتە: لە ئێمە نییە هەرکەسێك ڕووی دارنێت و یەخە دابدرێت و هەڵدات بەسەر مردوودا وەك سەردەمی نەفامی.

٨- هاوەڵێکی پێغەمبەر ﷺ کە ناوی (ئەبو موسای ئەشعەری) بوو ﵁ جارێك نەخۆش بوو، بورایەوە ئافرەتێکیش لەوکاتەدا

---

(١) رواه أحمد (٦/ ١٤١).

(٢) رواه أبو داود (٣١٦٣)، وابن ماجه (١١٩١) بسند صحيح، وفي " الإرواء " (٦٣٩) عن عائشة رضي الله عنها.

(٣) رواه البخاري (٤٤٥٥)، والنسائي (١٨٤١)، وصححه الألباني.

(٤) رواه البخاري (١٢٩٤)، ومسلم (١٠٣).

قیژاندی ئەویش سەرەتای بورانەوەکەی بوو نەیتوانی نەیەڵێت دوای ئەوەی کە هۆشی هاتەوە وتی: من بەریم لەوەی کە پێغەمبەری خوا ﷺ لێی بێ بەرییە، پێغەمبەر ﷺ بەرییە لە قیژاندن و قژڕنینەوەو یەخە دادڕین[١].

وە ئەم کردەوانە هەمووی بەس لە ئافرەت ئەوەشێنەوەو کردەوەی ئافرەتە بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێك ئافرەتەکان هاتن پەیمانیان لێ وەرئەگرتن فەرمانی دا: پەیمان بدەن کە بت نەپەرستن و هاوەڵ بۆ خوا دانەنێن و زینا نەکەن و دزی نەکەن و لەسەر مردوو شین و گریان و لەخۆدان نەکەن. یەکێك لەو کۆمەڵە ئافرەتەی پەیمانی دا بە پێغەمبەر ﷺ ناوی (أم عطية) بوو کە دەڵێت یەکێك لەو پەیمانانەی کە پێغەمبەری خوا ﷺ لێی وەرگرتین ئەوە بوو: نابێت شین و گریان لەسەر مردوو بکەین، وە لە هەموو ئەو کۆمەڵە ئافرەتە پەیمانەکەیان نەبردە سەر بێجگە لە پێنج ئافرەت نەبێت[٢].

٩- (عبدالله ی کوڕی عومەر) رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا ئەڵێت: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: «إِنَّ الْمَيِّتَ لَيُعَذَّبُ بِبُكَاءِ أَهْلِهِ عَلَيْهِ»[٣].

---

(١) رواه البخاري (١٢٩٦)، ومسلم (١٠٤)، و " أحكام الجنائز " ص٣٠.

(٢) رواه البخاري (١٣٠٦)، ومسلم (٩٣٦)، و " أحكام الجنائز " ص٢٨.

(٣) رواه البخاري (١٢٨٦)، ومسلم (٩٢٧)، و " أحكام الجنائز " ص٢٨.

واتە: مردوو بە گریان لەسەری ئازار دەچێژێت لە گۆڕدا.

١٠- هەروەك (عبداللّٰه ی کوڕی ڕەواحە) جارێك ناساغ بوو بورایەوە خوشکەکەشی بەدەنگی بەرز ئەگریاو ئەی لاواندەوە هەرجارێ بەشێوەو وەسفێك، کاتێ هۆشی هاتەوە سەر خۆی (عبداللّٰه) بە خوشکەکەی وت: هەرچییەك وەسفت دەکردم و ئەتلاواندمەوە یەکە یەکە پێیان ئەوتم تۆ ئەوەی؟ تۆ ئەوەی؟ ئیتر ئەو خوشکەی وازی لەو کردەوەی هێنا تەنانەت (عبداللّٰه) ش شەهید بوو لە جەنگی (مۆتە) نەگریا[١].

بەڵام ئەگەر چەند وشەیەك بەکاربهێنن و بیلێن لەکاتی مردنی کەسێکی خزمی دا کە دوور بێت لە وەسفو ڕیایی دونیاوە، وە مەبەستی نارەزایی دەربڕین و لاواندنەوە نەبێت لەناو خەڵکی دا ئەوە ڕێگەی دراوەو تاوانبار نابێت بە ئیزنی خوا.

١١- پێش ئەوەی پێغەمبەر ﷺ کۆچی دوایی بکات چەند جارێك ئەبورایەوە، (فاطمة) هاتە ژوورەوە و وتی: هاوار باوکم چەند لە ئێش و ئازاردایە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: لەمڕۆ بەدواوە باوکت لە ئێش و ئازاردا نابێت[٢]. دوای ئەوە پێغەمبەر ﷺ کۆچی دوایی کرد،

---

(١) رواه البخاري (٤٢٦٧، ٤٢٦٨)، والبيهقي (٤/ ٦٤)، و " أحكام الجنائز " ص٢٩.

(٢) رواه البخاري (٤٤٦٢).

(فاطمة) وتی: ئەی باوکە خوا داواکەی لیێ وەرگرتیت[١]. ئەی باوکە بەهەشتی فیردەوس جێگاتە و (جوبرەئیل) هاوەڵتە.

**١٢**–وە کاتێ (ئەبوبەکر) ﵁ چووە سەر پێغەمبەر ﷺ کۆچی دوایی کردبوو نێوان هەردوو چاوی ماچ کردو وتی: «وَانَبِيَّاهْ، واخَلِيلَاهْ، وَاصَفِيَّاهْ»[٢].

**واتە:** ئەی هاوار بۆ پێغەمبەری خوا، بۆ هاوڕێی خۆشەویست، بۆ هەڵبژاردەی خوا.

**١٣**–ئەم وشانەی کە باسمانکرد هیچی نارەزایی دەربڕین و هەڵەی تێدا نەبوو لەبەرئەوەی هەمووی وەسفی ڕاستی و چۆنیەتی مردووەکەی تێدا بوو. بەو شێوە باسی کرد کە هەموو کەس زانیویەتی و هەستی پێکردووە، هەروەك کاتێك (ئیبراهیم)ی کوڕی پێغەمبەر ﷺ مرد فەرمووی: « ...وَإِنَّا بِفِرَاقِكَ يَا إِبْرَاهِيمُ لَمَحْزُونُونَ»[٣].

---

(١) مەبەستی ئەوە بوو کە پێغەمبەر فەرمووی لەمڕۆ بەدواوە لە ئێش و ئازاردا نامێنمەوە، وادیارە بۆ سبەینێ ئەو ڕۆژە کۆچی دوایی کردووە.

(٢) رواه البخاري (٣/ ٨٩)، والنسائي (١/ ٢٦٠)، وصحيح سنن ابن ماجه (٢١٥٥)، وأحمد (٢٥٢٩٨، ٢٧١١١).

(٣) سبق تخريجه ص٣٥.

واتە: ئەی (ئیبراهیم) بەبۆنەی دوورکەوتنەوەی تۆوە خەفەتبار و دڵگرانین.

## ڕوونکردنەوەیەك

١- (عبدالله ی کوڕی عومەر) رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا ئەڵێت: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: «إِنَّ الْمَيِّتَ لَيُعَذَّبُ بِبُكَاءِ أَهْلِهِ عَلَيْهِ»[١].

واتە: مردوو ئازار دەدرێت بەگریانی زیندو لەسەری.

هەر بەم شێوەیە بە پێنج هاوەڵ ئەم فەرموودەیەیان گێڕاوەتەوە، (عومەری کوڕی خەتاب رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ و عبدالله ی کوڕی، موغیرەی کوڕی شەعبەو عەمرانی کوڕی حەصین و ئەبو موسای ئەشعەری)، بەڵام کاتێك هاوەڵەکان ئەمەیان بۆ عائیشەی خێزانی پێغەمبەر گێڕایەوە دژایەتی کردو وتی: ئەوە نییە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَلَا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَىٰ﴾ [الأنعام : ١٦٤] واتە: هیچ کەس تاوانی کەسی بۆ ناچێت، بەڵام ئێوە لە یەکێکەوە ئەگێڕنەوە نە درۆزنن نە ناوبراون بە خراپە، بەڵام بیستن هەڵە دەکات (واتە ڕەنگە بە هەڵە تێگەیشتبن)، بەڵام پێغەمبەر ﷺ جارێك تێپەڕ بوو بەسەر گۆڕێکی جولەکەدا

---

(١) سبق تخريجه ص٥٥.

فەرمووی: «إِنَّ صَاحِبَ هَذَا لَيُعَذَّبُ وَأَهْلُهُ يَبْكُونَ عَلَيْهِ»[(١)].

واتە: خاوەنی ئەم گۆڕە لە سزادایە و کەس و کاریشی بۆی دەگرین.

٢- (عائیشە) ﷺ دەیگێڕێتەوە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: «إِنَّ اللهَ لَيَزِيدُ الكَافِرَ عَذَابًا بِبُكَاءِ أَهْلِهِ عَلَيْهِ»[(٢)].

واتە: خوا ئازاری بێبڕوا زیاد دەکات لە گۆڕدا کاتێك خزم و کەس وکاری لەسەری ئەگرین.

بەڵام بۆ ئەو دوو ڕیوایەتەی نێوان (عومەری کوڕی خەتاب) و چوار هاوەڵەکان لەگەڵ (عائیشە) ﷺ خێزانی پێغەمبەری خوا ﷺ زانای پایە بەرزی ئیسلام (ابن تيمية) ﷺ دەڵێت: هەموو موسوڵمانێك ئەگەر زانی کاتی مردن شین ئەکەن و ئەگرین لەسەری پێویستە ئامۆژگاریان بکات و وەسیەت بکات کە نەگرین لەسەری، وە گەر وەسیەتی نەکرد کە نەگرین لەسەری ئەوە ڕەزامەندە پێی، وەکو ئەوە وایە کە خراپە ببینێت و فەرمان بە لابردنی نەکات، لەگەڵ ئەوەش دا کە توانای بەسەری دا بشکێت، وەکو ئەم چۆن تاوانبار

---

(١) رواه البخاري (١٢٨٩)، ومسلم (٩٣١).

(٢) رواه البخاري (١٢٨٨)، ومسلم (٩٢٩).

دەبێت ئەویش ئاوا تاوانبار دەبێت، واتە وەکو کردەوەی خۆی لێدێت و سزا دەدرێت لەسەر ئەو کردەوەیەی، بەم شێوەیە لەگەڵ ئایەتەکەدا دەگونجێت.

هیچ کەس لەبەر کردەوەی کەس ئازار نادرێت وەك (عائیشە) ﵂ دژایەتی گێڕانەوەی حەدیسەکەی (عومەری کوڕی خەتاب) دەکات، وە هیچ دوور نییە کە هەندێك شت دوور بووە لە (عائیشە)وە نەیبیستووە لە پێغەمبەر ﷺ لەبەر ئەوەی ئامادە نەبووە لەو کاتەدا، وە شتێکی ڕوون و ئاشکرایە کە هەڵە و لەبیرچوونەوە دەربارەی (عومەری کوڕی خەتاب)و ئەو چوار هاوەڵە گەورانە شتێکی زۆر دوور و نادروستە، وە ڕای زۆربەی زانایان لەسەر ئەوەیە کە ئەگەر وەسیەت بکات بەگریان لەسەری ئەو کاتە تاوانبار ئەبێت و سزای لەسەر ئەدرێت، بەڵام وەسیەت بکات کە نەیکەن یاخود ناڕازی بێت ئەوا بەر ئەم هەڕەشەیە ناکەوێت[١].

هەروەك (عبداللە ی کوڕی موبارەك) ئەفەرموێت: إِذَا كَانَ يَنْهَاهُمْ فِي حَيَاتِهِ فَفَعَلُوا شَيْئًا مِنْ ذَلِكَ بَعْدَ وَفَاتِهِ لَمْ يَكُنْ عَلَيْهِ شَيْءٌ[٢].

---

(١) مجموع الفتاوى لإبن تيمية (١٨/ ١٤٢)، وعدة الصابرين لإبن القيم (١٧٤).

(٢) فتح الباري شرح صحيح البخاري لإبن حجر (٣/ ١٥٣)، بهجة الناظرين شرح رياض الصالحين لسليم الهلالي (٣/ ١٦٨).

واتە: ئەگەر لە ژیان دا فەرمان بە نەکردنی بکات وە لەدوای خۆی ئەو کارانەیان کرد ئەوە بە تاوان نانوسرێت لەسەری.

وە ئیمامی (بوخاری) سەردێڕی ئەم فەرموودەیەی بە ناونیشانی (إذا كان من سنته) بە ژمارە (١٢٠٧) داناوە، واتە: ئەگەر لە کارو کردەوەی خۆی بوو، واتە پێی خۆش بوو فەرمانی بە نەکردنی نەدا.

## ئارامگرتن و سوپاس و ستایشکردنی خودا

ئایا خوای گەورە کامیانت پیٚ ببەخشێت لە (ئارامگرتن یان سوپاس و ستایشکردنی خودا لەکاتی هەژاری دا، وە یاخود لەکاتی دەوڵەمەندی دا، تاوەکو جێگەی ڕەزامەندی خوا بێت لە دونیاو قیامەت دا، وە یاخود کامیان دەبێتە هۆی پلە بەرزی ئادەمیزاد لای پەروەردگاری هەموو جیهان تا لە سزای ئاگر دوورە پەرێز بێت و بە بەهەشتی بەرین شاد بێت؟!

زانا (أبي فرج الجوزي) لەم وتو وێژەدا سیٚ ڕای زانایان باس دەکات:

**یەکەم:** ئارامگرتن (الصبر) باشترە.

**دووەم:** سوپاس و ستایشکردنی خوا (الشكر) باشترە.

**سێیەم:** هەردوو کیان.

بەڵام تەواوی کاری باوەڕو (ئیمان) هەردووکیانن، وەك (عبداللّٰه ی کوڕی مەسعود) دەفەرموێت: «الْإِيمَانُ نِصْفَانِ نِصْفٌ شُكْرٌ، وَنِصْفٌ صَبْرٌ»[١].

واتە: باوەڕ دوو نیوەیە، نیوەی ئارامگرتنە وە نیوەی سوپاسگوزارییە.

هەروەك خوای گەورە لە سورەتەکانی [إبراهيم، الشورى، سبأ، لقمان] هەردووکیانی کۆکردۆتەوە، وە ئەفەرموێت: ﴿إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَاتٍ لِّكُلِّ صَبَّارٍ شَكُورٍ﴾ [إبراهيم : ٥].

(عومەری کوڕی خەتاب) ﷺ فەرموویەتی: «لَوْ كَانَ الصَّبْرُ وَالشُّكْرُ بَعِيرَيْنِ مَا بَالَيْتُ أَيُّهُمَا رَكَبْتُ»[٢].

واتە: ئەگەر ئارامگرتن وشترێك بێت و سوپاسکردنی خوا وشترێك بێت سواری هەرکامیان ببم وەکو یەکە بەلامەوە. واتە هەردووکیان مایەی سەربەرزی موسوڵمانن بۆ لای خوا، ئەگەر زمانێکی پاراوی شوکرانەت پێ ببەخشێت و ئارامێکی زۆرت پێ

---

(١) مدارج السالكين جـ٢ص٢٤٢.

(٢) البيان والتبين (٣/ ١٢٦).

ببەخشێت لەسەر هەژاری و دەوڵەمەندی یاخود کاتی خۆشی و بەڵاو ناخۆشی.

وە بۆ ڕوونکردنەوەی باسەکە هەریەك لەو دووانە بە بەڵگەی قورئان و فەرموودەکان باس دەکەین تا شارەزابین بەسەر هەردوولادا.

ئەمانەی کە ئارامگرتن بە پلە بەرزترین دادەنێن تاوەکو سوپاسگوزاری دەڵێن:

خوای گەورە لە زۆر شوێنی قورئان دا وەسفی باسی ئارامی کردووە بە چەندەها شێوە و پەیوەندی بەستووە بە هەموو کردارەکانی خێر و چاکەوە، جا لە قورئان دا باسی کردووە هەرجارەی بە شێوازی پلە و باسێکەوە، وەك دەفەرموێت: ﴿وَلَنَجْزِيَنَّ ٱلَّذِينَ صَبَرُوٓاْ أَجْرَهُم بِأَحْسَنِ مَا كَانُواْ يَعْمَلُونَ﴾ [النحل : ٩٦]. وە خواپەرستی: ﴿وَٱسْتَعِينُواْ بِٱلصَّبْرِ وَٱلصَّلَوٰةِ﴾ [البقرة : ٤٥].

ئەمانەو چەندەها بەڵگەی ترمان هەیە کە باسمانکردووە لەو باسانەی پێشوودا پێم وایە دووبارەیە ئەگەر باسیان بکەینەوە، جا لەبەر ئەوەی تا ئێستا لەسەر دان بەخۆداگرتن بووە باسەکەمان وە زیاتر ئەم لایەنەمان ڕوون کردوّتەوە، کەواتە با بچینە سەر باسی سوپاس و ستایش بزانین تا چ ڕادەیەك مایەی پلە بەرزییە ئەگەر یەکێك خوا زمانێکی سوپاسگوزاری پێ ببەخشێت.

## سوپاس و ستایشی خودا (الشكر)

وە ئەوانەش کە سوپاسگوزاری بە پلە بەرزتر دادەنێن نموونەی بۆ دەهێننەوەو ئەڵێن:

هەروەك پێغەمبەر ﷺ زۆر لە پاڕانەوەکانی ئەوە بووە کە خوا زمانێکی پێ ببەخشێت کە پاراو بێت بە سوپاس و ستایشی خوا، وە هەر شوکرانەی خوایە دەبێتە هۆی لەبیر نەچوونی ئەو بەندەیە لای خوا: ﴿فَاذْكُرُونِي أَذْكُرْكُمْ وَاشْكُرُوا لِي وَلَا تَكْفُرُونِ﴾ [البقرة : ١٥٢]، وە هۆی زیاد بوونی ماڵ و سامانە: ﴿لَئِن شَكَرْتُمْ لَأَزِيدَنَّكُمْ﴾ [إبراهيم : ٧]، وە هەر سوپاسگوزارییە دەبێتە هۆی ڕەزامەندی خوا: ﴿وَإِن تَشْكُرُوا يَرْضَهُ لَكُمْ﴾ [الزمر : ٧]، وە پاداشتی بێگومانیان هەیە: ﴿وَسَيَجْزِي اللَّهُ الشَّاكِرِينَ﴾ [آل عمران : ١٤٤]، وە لای خوا شوێنی ڕێزە بۆیە بە (موسا) عليه السلام دەفەرموێت: ﴿وَكُن مِّنَ الشَّاكِرِينَ﴾ [الأعراف : ١٤٤]، وە وەسفی (ئیبراهیم) عليه السلام دەکات دەفەرموێت: ﴿شَاكِرًا لِّأَنْعُمِهِ اجْتَبَاهُ وَهَدَاهُ إِلَىٰ صِرَاطٍ مُّسْتَقِيمٍ﴾ [النحل : ١٢١]، وە بە کەم ناوی بردوون دەفەرموێت: ﴿وَقَلِيلٌ مِّنْ عِبَادِيَ الشَّكُورُ﴾ [سبأ : ١٣] و ﴿لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ﴾ [الأنفال : ٢٦] و ﴿وَاشْكُرُوا لِي وَلَا

تَكۡفُرُونِ﴾ [البقرة : ١٥٢]، وە پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوەندە شەونوێژی دەکرد تەنانەت هەردوو قاچی ئاوسا بوون، (عائیشە) ﵂ خێزانی وتی: بۆ وا دەکەیت ئەی پێغەمبەر کە خوای گەورە لە تاوانی لەمەو پێش و لەمەو پاشت خۆش بووە؟ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: «أَفَلاَ أَكُونُ عَبْدًا شَكُورًا»[1].

**واتە:** ئەی نابێ بەندەیەکی سوپاسگوزاری خوا بم.

وە خوای گەورە بە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: ﴿وَأَمَّا بِنِعۡمَةِ رَبِّكَ فَحَدِّثۡ﴾ [الضحى : ١١]، و ﴿لَئِن شَكَرۡتُمۡ لَأَزِيدَنَّكُمۡ﴾ [إبراهيم : ٧]، وە (عەلی کوڕی ئەبو تالیب) ﵁ دەفەرموێت: «إِنَّ النِّعْمَةَ مُوَصَّلَةٌ بِالشُّكْرِ، وَالشُّكْرُ مُعَلَّقٌ بِالْمَزِيدِ ...»[2].

**واتە:** نیعمەتی خوا بە سوپاسگوزاری بەندەکەیەوە بەستراوە، وە سوپاسگوزاری خواش بە زیاد و زۆربوونەوە بەستراوە، ئەمانە پەیوەندییان بە یەکەوە بەستراوە، سوپاسکردنی خوا بەشێوەش دەبێت دەربڕدرێت وەك زمان و دڵ دەری دەبڕێت.

---

(١) رواه البخاري (١٠٦١)، ومسلم (٥٠٢٢).

(٢) ابن أبي الدنيا في " الشكر " (١٨)، والبيهقي في " شعب الإيمان " (٤٢١٤).

وە پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: «إِذَا أَنْعَمَ اللهُ عَلَى عَبْدٍ أَحَبَّ أَنْ يَرَى أَثَرَ نِعْمَتَهُ عَلَيْهِ»[(١)].

**واتە:** خوا پێی خۆشە ڕەنگدانەوە و شێوەی نیعمەت بە بەندەکەیەوە دیار بێت.

وە دەفەرموێت: «... وَمَنْ لَا يَشْكُرُ الْقَلِيلَ لَا يَشْكُرُ الْكَثِيرَ، وَمَنْ لَا يَشْكُرُ النَّاسَ لَا يَشْكُرُ اللهَ ...»[(٢)].

**واتە:** هەر کەس سوپاسی شتی کەم نەکات سوپاسی شتی زۆریش ناکات، هەرکەس سوپاسی خەڵکی نەکات سوپاسی خواش ناکات.

پێغەمبەر ﷺ ئامۆژگاری موسوڵمانان دەکات دەفەرموێت: «إِذَا نَظَرَ أَحَدُكُمْ إِلَى مَنْ فُضِّلَ عَلَيْهِ فِي الْمَالِ وَالْخَلْقِ، فَلْيَنْظُرْ إِلَى مَنْ هُوَ أَسْفَلَ مِنْهُ مِمَّنْ فُضِّلَ عَلَيْهِ»[(٣)].

**واتە:** ئەو کەسەی دەیەوێت بزانێت خوا چەندێ نیعمەتی پێ بەخشیوە با سەیری ئەوانە بکات کە لە خواری خۆیەوەن، سەیری

---

(١) ابن أبي الدنيا في " الشكر " (٥٠).

(٢) رواه أبوداود (٤٨١١)، والترمذي (١٩٥٥)، وابن أبي الدنيا في " الشكر " (٦٤)، وأحمد في " المسند " (٤/ ٢٧٨)، وحسنه سليم الهلالي في " تحقيق عدة الصابرين " ص١٩٩.

(٣) رواه البخاري (٦٤٩٠)، ومسلم (٢٩٦٣).

ئەوانەی پێیان بەخشراوە نەکات.

(عەبدوڵڵای کوڕی عومەر) رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا دەڵێت: ئێمە (واتە هاوەڵەکان) لە ڕۆژێك دا چەندەها جار بەیەك دەگەیشتین هەواڵی یەکترمان دەپرسی هەمووومان سوپاسی خوامان دەکرد لەسەر نیعمەتەکانی، وە هەواڵ پرسییەکەشمان بەس لەبەر سوپاسکردنی خوا بوو[1].

پرسیاریان لە خواناسێك کرد وتیان: سوپاسکردن لەسەر چاو کە خوا پێی داویت چۆنە؟[2] وتی: هەر چاکەیەکم پێ ببینیبێت باسم کردووە، وە هەر خراپەیەکم پێ ببینیبێت شاردومەتەوە. وتیان: ئەی گوێ؟ وتی: هەر خێرێکم پێ بیستبێت بەکارم هێناوە، هەر خراپەیەکم پێ بیستبێت دوورە پەرێز بووم. وتیان: ئەی دەست؟ وتی: شتێك مافی خۆم بوو بێت پێم وەرگرتووە، وە مافی خوام تێدا قەدەغە نەکردووە. وتیان: ئەی سك؟ وتی: خوارەوەی بۆ خواردن سەرەوەی بۆ زانست و زانیاری، ئەمانە هەمووی سوپاسگوزاری ڕاستەقینەن[3]، وە کۆتایی پلەی ڕاستەقینەی سوپاسگوزاریش ئەوەیە کە کڕنوش ببات و بکەوێت

---

(١) ابن المبارك في " الزهد " (١٠٧)، وابن أبي الدنيا في " الشكر " (٩٤)، والبيهقي في " الشعب " (٤٤٥١).

(٢) واتە سوپاسکردنی خوا بە چ شێوەیەك بکەین کە چاوی پێ بەخشیوین.

(٣) ابن أبي الدنيا في " الشكر " (١٢٩)، وأبو نعيم في " الحلية " (٣/ ٢٤٣).

بە كڕنوش دا بۆ خوا (سجدة الشكر)، هەروەك پێغەمبەری خوا كڕنوشێكی زۆر درێژی برد كە (جبريل) هەواڵی بۆ هێنا هەركەس سەڵەواتێك بدا لە پێغەمبەر[1] خوای گەورە دە جار سڵاواتی پێ دەگەیەنێت.

(ئەبوبەكر) ﵁ جێنشینی پێغەمبەر كڕنوشی برد كاتێك هەواڵی كوشتنی (موسەیلەمە)ی درۆزنیان بۆ هێنا.

(عەلی كوڕی ئەبوتالێب) ﵁ كڕنووشی برد كە بینی ئەوەی پێغەمبەر وەسفی كردووە كوژراوە لەناو خەوارجەكان.

وە (كەعبی كوڕی مالیك) ﵁ كڕنوشی برد كە هەواڵی لێخۆشبوونی خوایان بۆ هێنا بەهۆی ئەوەی كە دواكەوتبوو لە جەنگی (تەبوك).

(حەسەنی بەسری) ﵀ كڕنوشی برد كاتێ هەواڵی مردنی (حەجاج) یان بۆ هێنا[2].

لەبەر ئەوەی كڕنووش واتای بەندایەتی و سوپاسگوزاری تێدایە بەرامبەر بە خوا، وە واتای گەورەیی و دەسەڵاتداری خوای تێدایە.

---

(١) كتاب " فضل الصلاة على النبي ﷺ " للألباني برقم (٢٥) وسنده صحيح.

(٢) بۆ ئەم سوجدەی شوكرانە بڕوانە: مصنف ابن أبي شيبة (٨١٤٢) وما بعده (٢/ ٢٢٨)، وابن أبي الدنيا في " الشكر " (١٣٧).

ئەو کڕنوش بەرانەی باسمانکرد کاتێك کڕنوشیان بردووە کە ئەوەی پێیان خۆشە هاتووەتە دی، وە ئەوانیش کڕنووشیان بردووە لەسەر ئەو خۆشییە کە ئاواتیان بووە، ئەمە ئەوپەڕی سوپاس و ستایش دەربڕینە بۆ خوای گەورە، وە زانایانی ئیسلام چەندەها وردەکاری باس دەکەن لە بارەی سوپاسگوزارییەوە هەموو پڕ سوودو بەنرخە، ئێستەش چەند وتەیەکی جوانیان لێ باس دەکەین وەك هەندێکیان ئەڵێن بە سێ پلە نەبێت سوپاسکردن تەواو نابێت و مافی خۆی پێ نادەیەت:

١- دان نان بە نیعمەتەکانی خوا.

٢- سوپاس و ستایشکردنی خوا لەسەری.

٣- بەکارهێنانی ئەو ماڵە لەپێناوی ڕەزامەندییەکانی خوا.

هەروەك ئەڵێن: ئەگەر ناتوانیت بەدەست سەرفی بکەیت لەپێناوی خوادا (واتە ڕەزیلی) با زمانت پاراو بێت بە سوپاسگوزاری خوا.

سوپاسکردنی خوا بە سێ شت لە لەش دا سوپاسی تەواوی پێدەکرێت:

١- بە دڵ (هەست بەو نیعمەتە بکەیت).

٢- بە زمان (سوپاس و ستایشی خوای پێبکات).

٣- ئەندامەکانی لاشە بەکاری بهێنێت لە ڕەزامەندی خواو دوور لە تاوانباری.

بۆ ڕوونکردنەوەی ئەم بابەتە کە ئایا ئارامگرتن یان سوپاسگوزاری کامیان پلەیان بەرزترە لای خوای گەورە، زانایان ئەم دوو شێوازەیان بردۆتەوە سەر خاوەنەکانیان کە هەژارێکی ئارامگر باشترو پلە بەرزترە لەسەر هەژاری و نەبوونییەکەی کە هیچ سکاڵا و نارەزانییەکی تێدا دەرنەبڕێت، یاخود دەوڵەمەندێکی سوپاسگوزار کە لەپێناو ڕەزامەندی خوا ماڵ و سامانەکەی بەکار بێنێت و سوپاس و ستایشی خوای لەسەر بکات؟

هەریەك لە زاناکان لایەکیان بە باشتر داناوە تا لایەکەی تر بەگوێرەی بیروبۆچوونی خۆیان و تێگەیشتن لە بەڵگەکان، بەڵام (ابن القیم) خوا پاداشتی بداتەوە هاتووە وەکو کۆبوونەوەیەکی باوەڕداران تێکەڵ لە هەردوولا لەسەر زمانیان بەڵگەکانی ڕوون کردووەتەوە تا وەکو شێوەیەکی ڕاستی بەسەرهات خوێنەر لە بابەتەکەی تێبگات، وە لەدوای دارشتنی باسی هەردوولایان دەربڕینی هەموو ڕاستییەکیان هەڵدەستێت بە (صلح) و کۆتایی هاتن بە دووبەرەکایەتی هەردوولاو یاسا (حکم)ی ڕاستی دەدات بەسەر بابەتەکەداو کۆتایی بە هەموو باس و لێکۆڵینەوەیەکی نێوانیان دەهێنێت، بە شیتەڵ کردنەوە ئەیسەلمێنێت کە هەردوو لایان مایەی خێر و ڕەزامەندی هەردوو دونیایە هەریەکەی بەشێوەیەك پلەی خێریان دەست دەکەوێت وەکو ئەم فەرموودانە

شیتەڵی دەکاتەوە:

١ – پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: «يَدْخُلُ فُقَرَاءُ الْمُؤْمِنِينَ الْجَنَّةَ قَبْلَ الْأَغْنِيَاءِ بِنِصْفِ يَوْمٍ، خَمْسِمِائَةِ عَامٍ»[(١) (٢)].

**واتە:** هەژارەکانی گەلی من دەچنە بەهەشتەوە لەپێش دەوڵەمەندەکانەوە بە نیو ڕۆژ ئەویش پێنج سەد ساڵە.

ئەمەش بەڵگە نییە لەسەر ئەوەی کە هەژارەکان پلەیان بەرزترە وە پلەیان زیاترە لە دەوڵەمەندەکان، بەڵکو لەبەرئەوەیە هەژارەکان زووتر یاخود پێنج سەد ساڵ لەپێش دەوڵەمەندەکانەوە دەچنە بەهەشتەوە کە لە دادگای خوا (محاسبة) زووتر تەواو دەبن، چونکە خاوەنی ماڵ و سامانێکی زۆرتر نەبوون تاکو دادگایی یە کەیان درێژە بخایەنێت، بەڵام دەوڵەمەندەکان لەبەر ئەوەی خاوەنی ماڵ و سامانێکی زۆرن لێپرسینەوەی زیاتریان هەیەو درەنگتر لێ ئەبنەوە، وە ڕەنگە دەوڵەمەندەکان لەبەر لێپرسینەوە (محاسبة) درەنگتر بچنە بەهەشتەوە و پلەیان بەرزتر بێت لە هەژارێك کە زووتر ئەچێتە بەهەشتەوە.

---

(١) (٢) رواه الترمذي (٢٣٥٤)، وفي " صحيح سنن ابن ماجه " للألباني برقم (٣٣٢٦).

هەر ڕۆژێکی قیامەت هەزار ساڵی ئێمەیە وەکو خوا دەفەرموێت: ﴿وَإِنَّ يَوْمًا عِنْدَ رَبِّكَ كَأَلْفِ سَنَةٍ مِمَّا تَعُدُّونَ﴾ [الحج: ٤٨].

٢- کۆمەڵێك هەژار هاتن بۆ لای پێغەمبەر ﷺ وتیان: ئەی پێغەمبەر ﷺ دەوڵەمەندەکان بەبۆنەی ئەوەوە کە پارەو سامانیان هەیە خێرو چاکە دەکەن و بەندە ئازاد دەکەن، وە کردەوەیان زۆر دەبێت پێش ئێمە دەکەون بۆ چوونە بەهەشتەوە، پێغەمبەریش فەرمووی: «جَاءَ الْفُقَرَاءُ ... " فَإِذَا صَلَّيْتُمْ، فَقُولُوا: سُبْحَانَ اللَّهِ ثَلَاثًا وَثَلَاثِينَ مَرَّةً، وَالْحَمْدُ لِلَّهِ ثَلَاثًا وَثَلَاثِينَ مَرَّةً، وَاللَّهُ أَكْبَرُ أَرْبَعًا وَثَلَاثِينَ مَرَّةً...»، وفي رواية «وَكَبَّرَ اللَّهَ ثَلَاثًا وَثَلَاثِينَ، فَتِلْكَ تِسْعٌ وَتِسْعُونَ ، ثُمَّ قَالَ: تَمَامُ الْمِائَةِ: لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ ...»[١].

واتە: کارێکتان پێ بڵێم ئەگەر بیکەن ئێوەش وەك ئەوان خێرو چاکەتان زۆر دەبێت: یادی خوا بکەن لەدوای هەموو نوێژێك (٣٣ جار سبحان الله)، (٣٣ جار الحمدلله)، (٣٣ جار الله أكبر)، وە (١ جار لاإله إلاالله وحده لاشريك له له الملك وله الحمد وهو على كل شيء قدير). کاتێك دەوڵەمەندەکان ئەمەیان بیست ئەوانیش دەستیان کرد بە هەمان زیکرو یاد خوێندن، هەژارەکانیش زانیان بەمە چوونە لای پێغەمبەر ﷺ بۆیان گێڕایەوە کە دەوڵەمەندەکانیش بەو شێوەیە

---

(١) رواه الترمذي (١٧١١)، وأحمد (٨٨٩٢).

زیکر دەخوێنن سەرەڕای دەوڵەمەندییەکانیان، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: «ذَلِكَ فَضْلُ اللهِ يُؤْتِيهِ مَنْ يَشَاءُ»[(١)].

واتە: ئەوە بەخشش و پلەیەکە خوا دەیبەخشێت بەو بەندانەی کە ویستی لەسەرە.

لێرەدا مەبەستی هەژارەکان ئەوە بوو کە بگەنەوە بە کردەوەی دەوڵەمەندەکان، بەڵام پێغەمبەر ﷺ پێی نیشاندان کە هەریەکەتان ڕێگەو کاری خێری تایبەتی خۆی هەیە.

بەڵام با ئەوەش بزانین دەوڵەمەندی ماڵ و سامان هۆیەکە بۆ تاقیکردنەوەی بەندەکانی، هەروەك هەژاریش تاقیکردنەوەیە کە بۆ دەرکەوتنی ئارام و ڕەزامەندی بەندەکانیەتی وەك دەفەرموێت: ﴿وَهُوَ ٱلَّذِى جَعَلَكُمْ خَلَٰٓئِفَ ٱلْأَرْضِ وَرَفَعَ بَعْضَكُمْ فَوْقَ بَعْضٍ دَرَجَٰتٍ﴾ [الأنعام : ١٦٥]، ﴿وَنَبْلُوكُم بِٱلشَّرِّ وَٱلْخَيْرِ فِتْنَةً ۖ وَإِلَيْنَا تُرْجَعُونَ﴾ [الأنبياء : ٣٥]، ﴿إِنَّا جَعَلْنَا مَا عَلَى ٱلْأَرْضِ زِينَةً لَّهَا لِنَبْلُوَهُمْ أَيُّهُمْ أَحْسَنُ عَمَلًا﴾ [الكهف : ٧].

ئەمانە هەمووی بەڵگەن بۆ ئەوەی هەژاریی و دەوڵەمەندیی هۆیەکن بۆ تاقیکردنەوەی ئادەمیزاد لە دونیادا وەکو هەموو شتەکانی تر،

---

(١) رواه البخاري (٥٩٧٥)، ومسلم (١٤٢).

هەروەك (عبدالله کوڕی عەباس) رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا ئەفەرموێت: «نَبْتَلِيكُمْ بِالْشِّدَّةِ وَالْرَّخَاءِ، وَالْصِّحَّةِ وَالْسَّقَمِ، وَالْغِنَى وَالْفَقْرِ، وَالْحَلَالِ وَالْحَرَامِ، وَ كُلُّهَا بَلَاءٌ»(١).

واته: خۆشی و ناخۆشی و لەش ساغی و نەخۆشی و هەژاری و دەوڵەمەندی و حەڵاڵی و حەرامی هەموویان مایەی تاقیکردنەوەن.

٣- ئارامگرتن و سوپاسگوزاری خوا هەموو نیعمەتێکی مایەی تاقیکردنەوەیە، وەکو پێغەمبەر (سولەیمان) عَلَيْهِ السَّلَامُ فەرموویەتی کە خوا ئەو هەموو نیعمەتەی پێ بەخشی بوو: ﴿هَٰذَا مِن فَضْلِ رَبِّي لِيَبْلُوَنِيٓ ءَأَشْكُرُ أَمْ أَكْفُرُ﴾ [النمل : ٤٠].

٤- پیاوێك جارێك بە (عوسمانی کوڕی عەفانی) رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ وت: ئەی خاوەن ماڵ و سامانەکان بە بۆنەی سامانەکانتانەوە خێرو چاکەو حەج و بەندە ئازادکردن پاداشتی زۆرتان دەست دەکەوێت، ئیمامی (عوسمان) فەرمووی: ئێوە ئاوات بە ئێمە دەخوازن و ئێمەش ئاوات بە ئێوە، سوێند بە خوا درهەمێك لەسەر نەبوونی و هەژاری و کەم

---

(١) تفسير الطبري (١٨/ ٤٤٠)، " شرح السنة " للالكائي (٧٠٠)، والسيوطي في " الدر المنثور " (٥/ ٦٢٩).

دەسەڵاتی بکەی بە خێر پاداشتی هەزار درهەمی هەیە کە لەسەر پارەوماڵێکی زۆر بیکەی بەخێر[(١)].

٥- وە لە پێغەمبەریان ﷺ پرسی: چاکترین خێر کامەیە؟ فەرمووی: «جُهْدُ الْمُقِلِّ، وَابْدَأْ بِمَنْ تَعُولُ»[(٢)].

واتە: لەسەر کەم دەسەڵاتی بە مەرجێك بزانیت کە ئارام دەگریت لەسەر نەبوونی و هەژاری.

٦- یەکێك چووە لای (سەهلی کوڕی عبدالله) ﷺ وتی: دز هاتووەتە ماڵەکەم هەرچی تیابوو بردوویەتی، ئەویش فەرمووی: سوپاسی خوا بکە ئەی ئەگەر دز بچوایەتە دڵتەوە (شەیتان) خواپەرستی لێ تێك بدایتایە چیت دەکرد؟!.

---

(١) البيهقي في " الشعب " (٣١٨٢)، وابن المبارك في " الزهد " (٧٧٠).

(٢) رواه أبو داود (١٦٧٧)، وأحمد (٢/٣٥٨)، وابن خزيمة (٢٤٤٤)، وابن حبان (٣٣٤٦)، والحاكم (١/٤١٤).

# بەڵگەکانی هەردوو لایان

بەڵگەی هەژارەکان لەسەر پلەی هەژاری لای خودا:

هەژارەکان سەرەی وتوویژیانە و دەڵێن: پێشەکی ئەی دەوڵەمەندەکان خوای گەورە لە قورئان دا باسی پارە و ماڵ ناکات تەنها بەم شێوانە نەبێت:

١- خوای گەورە لە قورئان دا بەشێوەی زەم و مایەی یاخی بوونی ئادەمیزاد ناوی دەبات: ﴿كَلَّآ إِنَّ ٱلۡإِنسَٰنَ لَيَطۡغَىٰٓ ۝٦ أَن رَّءَاهُ ٱسۡتَغۡنَىٰٓ﴾ [العلق : ٦-٧]، ﴿وَلَوۡ بَسَطَ ٱللَّهُ ٱلرِّزۡقَ لِعِبَادِهِۦ لَبَغَوۡاْ فِي ٱلۡأَرۡضِ﴾ [الشورى : ٢٧]. مەبەستی هەردوو ئایەتەکە یاخی بوونی مرۆڤە لەکاتی دەوڵەمەندی دا.

٢- وە باسی دەکات بە هۆیەك بۆ تاقیکردنەوەی موسوڵمانان: ﴿إِنَّمَآ أَمۡوَٰلُكُمۡ وَأَوۡلَٰدُكُمۡ فِتۡنَةٞ﴾ [التغابن : ١٥]، ﴿وَنَبۡلُوكُم بِٱلشَّرِّ وَٱلۡخَيۡرِ فِتۡنَةٗۖ وَإِلَيۡنَا تُرۡجَعُونَ﴾ [الأنبياء : ٣٥]. واتە مایەی تاقیکردنەوە و هەڵسەنگاندنە.

٣- وە ماڵ و سامان هیچ شتێك لەسەر خاوەنەکەی لانابات و

نزیکی ناکاتەوە لە خوا، وەك دەفەرموێت: ﴿ وَمَآ أَمْوَٰلُكُمْ وَلَآ أَوْلَـٰدُكُم بِٱلَّتِي تُقَرِّبُكُمْ عِندَنَا زُلْفَىٰٓ ﴾ [سبأ: ٣٧].

٤- ماڵ و سامان تام و چێژی ئەو کەسانەیە کە بەس لە دونیادا بەشیان هەیە وە لە ڕۆژی دوایی دا بێبەشن، وەك دەفەرموێت: ﴿ وَلَا تَمُدَّنَّ عَيْنَيْكَ إِلَىٰ مَا مَتَّعْنَا بِهِۦٓ أَزْوَٰجًا مِّنْهُمْ زَهْرَةَ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا لِنَفْتِنَهُمْ فِيهِ ﴾ [طه: ١٣١]، ﴿ أَذْهَبْتُمْ طَيِّبَـٰتِكُمْ فِي حَيَاتِكُمُ ٱلدُّنْيَا وَٱسْتَمْتَعْتُم بِهَا ﴾ [الأحقاف: ٢٠]. وەك پێغەمبەر ﷺ بە (عومەری کوڕی خەتاب)ی فەرموو: «أَمَا تَرْضَى أَنْ تَكُونَ لَهُمُ الدُّنْيَا وَلَنَا الآخِرَةُ»(١).

واتە: ئەی ڕازی نابیت ڕۆژی دوایی بۆ ئێمە بێت و دونیا بۆ ئەوان بێت؟!.

٥- کاتێك باسی دەوڵەمەندەکان دەکات بە شێوەی لۆمە و خراپە باسیان دەکات: ﴿ إِنَّهُمْ كَانُوا۟ قَبْلَ ذَٰلِكَ مُتْرَفِينَ ﴾ [الواقعة: ٤٥]، ﴿ وَإِذَآ أَرَدْنَآ أَن نُّهْلِكَ قَرْيَةً أَمَرْنَا مُتْرَفِيهَا فَفَسَقُوا۟ فِيهَا ﴾ [الإسراء: ١٦]. کەواتە دەوڵەمەندەکان هۆی سەرەکی تیاچوونی خەڵکین.

---

(١) رواه البخاري (٤٩١٣)، ومسلم (١٤٧٩)، و" صحيح سنن ابن ماجه " (٣٣٥٠).

٦- خوای گەورە بە شێوەی ڕەخنە ناوی ئەو کەسانە دەبات کە پارەو ماڵیان خۆش دەوێت: ﴿وَتَأْكُلُونَ ٱلتُّرَاثَ أَكْلًا لَّمًّا ﴿١٩﴾ وَتُحِبُّونَ ٱلْمَالَ حُبًّا جَمًّا﴾ [الفجر: ١٩-٢٠].

٧- وە بە خراپە ناوی ئەمانە دەبات کە ئاواتیان ماڵی دونیایە، وە وەسفی ئەوانە دەکات کە مەبەستیان ڕۆژی دواییە: ﴿فَخَرَجَ عَلَىٰ قَوْمِهِۦ فِى زِينَتِهِۦ ۖ قَالَ ٱلَّذِينَ يُرِيدُونَ ٱلْحَيَوٰةَ ٱلدُّنْيَا يَـٰلَيْتَ لَنَا مِثْلَ مَآ أُوتِىَ قَـٰرُونُ إِنَّهُۥ لَذُو حَظٍّ عَظِيمٍ ﴿٧٩﴾ وَقَالَ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْعِلْمَ وَيْلَكُمْ ثَوَابُ ٱللَّهِ خَيْرٌ لِّمَنْ ءَامَنَ وَعَمِلَ صَـٰلِحًا وَلَا يُلَقَّىٰهَآ إِلَّا ٱلصَّـٰبِرُونَ﴾ [الأحزاب: ٧٩-٨٠].

٨- وە تەنانەت باسی ئەوانە بە خراپە دەکات کە گومانیان وایە بەس بە پارە و ماڵ هەموو شتێك دەکرێت، وە هۆیەکی سەرەکییە: ﴿وَقَالَ لَهُمْ نَبِيُّهُمْ إِنَّ ٱللَّهَ قَدْ بَعَثَ لَكُمْ طَالُوتَ مَلِكًا ۚ قَالُوٓا۟ أَنَّىٰ يَكُونُ لَهُ ٱلْمُلْكُ عَلَيْنَا وَنَحْنُ أَحَقُّ بِٱلْمُلْكِ مِنْهُ وَلَمْ يُؤْتَ سَعَةً مِّنَ ٱلْمَالِ﴾ [البقرة: ٢٤٧].

٩- وە هەواڵمان پێ دەدات کە ماڵ و سامان دەبێتە مایەی سەرقاڵی و بێئاگایی لە ڕۆژی دوایی: ﴿أَلْهَاكُمُ التَّكَاثُرُ ۝١ حَتَّىٰ زُرْتُمُ الْمَقَابِرَ﴾ [التكاثر: ١-٢].

دوای ئەم خاڵانە دەست دەکەن بە بەڵگە هێنانەوەی فەرموودەکانی پێغەمبەر ﷺ بۆ بەهێزکردنی باسەکەو دەڵێن:

«لَوْ كَانَ لِي مِثْلُ أُحُدٍ ذَهَبًا، لَسَرَّنِي أَنْ لاَ تَمُرَّ عَلَيَّ ثَلاَثُ لَيَالٍ وَعِنْدِي مِنْهُ شَيْءٌ، إِلَّا شَيْئًا أَرْصُدُهُ لِدَيْنٍ»[(١)].

واتە: گەر هاوشێوەی شاخی ئوحود ئاڵتوونم هەبێت پێم خۆش نییە سێ شەوم بەسەردا بێت هیچ شتێکم لا بمێنێت بێجگە لەوە نەبێت بۆ دانەوەی قەرز بێت.

وە دەفەرموێت: «اللَّهُمَّ ارْزُقْ آلَ مُحَمَّدٍ قُوتًا»[(٢)].

واتە: ئەی پەروەردگار ڕۆزی کەسی موحەمەد بە گوێرەی پێویست بێت.

ئەگەر ڕۆژێ ماڵ و سامان باش بوایە پێغەمبەرﷺ وەری دەگرت.

---

(١) رواه البخاري (٢٢١٣، ٦٠٥٨).

(٢) رواه البخاري (٦١٠٠) ، ومسلم (١٧٣٩، ٥٢٥٠)، والترمذي (٢٢٤٩)، وأحمد (١٠٣١٦، ١٢٢٦٤).

وە ئیمامی (ئەحمەد) ﵀ دەڵێت: عائیشە ﵂ دەڵێت: ئافرەتێکی مەدینەیی هات بۆ لام و ئەو جێگایەی بینی کە پێغەمبەر لەسەری دادەنیشت کۆنە و شی بۆتەوە، کاتێك گەڕایەوە بۆ ماڵەوە پارچەیەك ڕاخەری خوری بۆ ناردین، پێغەمبەر ﷺ هاتەوە بۆ ماڵەوە بینی فەرمووی: ئەوە چییە؟ وتم: فلانە ئافرەت ئەوەی بۆ ناردوین کاتێ ڕاخەرەکەی بینیوە، فەرمووی: بۆی بنێرەوە، ئەڵێت: دوو جار پێی وتم کە بۆی بنێرمەوە، بەلاَم منیش حەزم لێ دەکرد لە ماڵەکەم دا بێت، تا سێ جار پێی وتم، ئەوسا فەرمووی: «رُدِّيهِ يَا عَائِشَةُ، فَوَاللهِ لَوْ شِئْتُ لَأَجْرَى اللهُ مَعِيَ جِبَالَ الذَّهَبِ وَالْفِضَّةِ»[(١)].

واتە: ئەی عائیشە ئەگەر بمویستایە خوا شاخی بۆ دەکردم بە ئاڵتوون و زیوو دوای ئەخستم.

ئەگەر دەوڵەمەندی باش بوایە پێغەمبەری خوا ﷺ لە بچوکترین شتەوە کە ڕاخەرێکە وەری دەگرت و کۆی دەکردەوە تا گەورەترین شت، وە پێغەمبەری خوا هەموو دەم ڕەزامەند بوو بە نەبوونی و کەم دەستو زۆر کۆنەکردنەوە، هەموو کات ڕەزامەند بووە بە دان

---

(١) رواه أحمد في " الزهد " (٧٦)، وفي " سلسلة الأحاديث الصحيحة " (٢٤٨٤)، والبيهقي في " الشعب " (١٣٩٥)، وفي " الجامع الصحيح للسنن والمسانيد " (١٠/٤١٣).

بەخۆداگرتن لەسەر برسێتی و تینوێتی و تێرنەبوون، هەروەك لەم کۆمەڵە فەرموودانەی خوارەوە بۆمان دەردەکەوێت:

١ – (ئەنەس) ﷺ دەڵێت: «فَمَا أَعْلَمُ النَّبِيَّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ رَأَى رَغِيفًا مُرَقَّقًا حَتَّى لَحِقَ بِاللهِ، وَلاَ رَأَى شَاةً سَمِيطًا بِعَيْنِهِ قَطُّ»[1].

واتە: من بزانم پێغەمبەری خوا ﷺ هەتا کۆچی کرد نە نانێکی گەنمی نەرم و نە مەڕێکی برژاوی قەت نەخواردووە.

٢– (عائیشە) ﷺ دەڵێت: «مَا شَبِعَ آلُ مُحَمَّدٍ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مِنْ طَعَامٍ ثَلاَثَةَ أَيَّامٍ حَتَّى قُبِضَ»[2].

واتە: پێغەمبەر ﷺ لەوکاتەوە خزم وکەس و کاری هاتوونەتە مەدینە سێ شەو لەسەر یەك نانی گەنمیان نەخواردووە هەتا کۆچی کرد.

٣– (ئەنەس) ﷺ دەڵێت: «وَلَقَدْ رَهَنَ النَّبِيُّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ دِرْعَهُ بِشَعِيرٍ»[3].

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ کراسی ئاسنینی شەڕ (درع)ە کەی

(١) رواه البخاري (٥٤٢١).

(٢) رواه البخاري (٥٤١٦)، ومسلم (٢٩٧٠).

(٣) رواه البخاري (٢٥٠٨).

لەبری هەندێك جۆ لای خاوەنەکەی دانابوو تا پارەکەی بۆ دەبات لەبەر نەبوونی ماڵ.

٤- (عومەری کوڕی خەتاب) ﷺ دەفەرموێت: «لَقَدْ رَأَيْتُ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَظَلُّ الْيَوْمَ يَلْتَوِي، مَا يَجِدُ دَقَلًا يَمْلَأُ بِهِ بَطْنَهُ»[1].

واتە: ئەمبینی پێغەمبەر ﷺ ڕۆژی وا هەبوو ئەمایەوە هیچ نەبوو بیخوات.

٥- (عبدالله ی کوڕی عەباس) ﷺ دەفەرموێت: «أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ يَبِيتُ اللَّيَالِي الْمُتَتَابِعَةَ طَاوِيًا، وَأَهْلُهُ لَا يَجِدُونَ عَشَاءً»[2].

واتە: پێغەمبەر ﷺ چەندەها شەو ئەمایەوە لای خێزانەکانی هیچ نەبوو بیخۆن.

٦- (فاتمە)ی کچی پێغەمبەر ﷺ ڕۆژێ لەتێ نانی هێنا بۆ باوکی، وە پێغەمبەر فەرمووی: ئەم لەتە نانە چییە ئەی فاتمە؟ وتی: ئەوە لەتێك

(١) رواه مسلم (٢٩٧٨).

(٢) رواه الترمذي (٢٣٦٠)، وأحمد (٢٣٠٣)، وابن ماجه (٣٣٤٧)، وحسنه الألباني.

نانە دڵم تاقەتی نەگرت تا هێنام بۆت، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: «هَذَا أَوَّلُ طَعَامٍ أَكَلَهُ أَبُوكِ مِنْ ثَلَاثَةِ أَيَّامٍ»[1].

واتە: ئەمە یەکەم خواردنە دەچێتە دەمی باوکتەوە ماوەی سێ ڕۆژە.

٧- وە ئیمام (ئەحمەد) رَحِمَهُ ٱللَّٰهُ دەگێڕێتەوە لە (جابری کوڕی عبدالله)وە دەڵێت: « ... فَحَانَتْ مِنِّي الْتِفَاتَةٌ، فَإِذَا رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: قَدْ شَدَّ عَلَى بَطْنِهِ حَجَرًا»[2].

واتە: ئەو کاتەی پێغەمبەر ﷺ چاڵەکەیان هەڵدەکەند (شەڕی خەندەق) بە دەوری مەدینەدا برسێتییەکی زۆر ڕووی تێکردین، هەتا پێغەمبەر ﷺ وای لێهات بەردێکی لەبرسا بەست بە سکیەوە.

٨- وە بەهەمان گێڕانەوە (عوروە) دەڵێت: گوێم لێبوو (عائیشە) رَضِيَ ٱللَّٰهُ عَنْهَا دەیوت: «إِنْ كُنَّا لَنَنْظُرُ إِلَى الهِلاَلِ، ثُمَّ الهِلاَلِ، ثَلاَثَةَ أَهِلَّةٍ فِي شَهْرَيْنِ، وَمَا أُوقِدَتْ فِي أَبْيَاتِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَارٌ، فَقُلْتُ يَا خَالَةُ: مَا كَانَ يُعِيشُكُمْ؟ قَالَتْ: " الأَسْوَدَانِ: التَّمْرُ

(١) رواه أحمد (١٣٢٢٣)، والبيهقي في " الشعب " (١٠٤٣٠).

(٢) رواه البخاري (٣٧٩٠)، وأحمد (١٤٢١١).

وَالمَاءُ»[١].

**واتە:** مانگ بەسەرمان دا تێپەڕ ئەبوو لە ماڵێك لە ماڵەكانی پێغەمبەردا ئاگر نەدەكرایەوە. عورووە وتی: ئەی پوریێ[٢] بەچی دەژیان؟ وتی: بە خورماو ئاو، ناویان دەبرد بە (الأسودان) واتە: دوو ڕەشەكە لەبەر زۆر خواردنی.

**٩-** ڕۆژێك پێغەمبەر ﷺ لەبرسا چوو بۆ مزگەوت، وە لەدوای ئەو (ئەبوبەكر و عومەری)ش چوون بۆ مزگەوت بەدوای یەكەوە، وە كاتێ پێغەمبەر ﷺ بینینی فەرمووی: «مَا أَخْرَجَكُمَا مِنْ بُيُوتِكُمَا هَذِهِ السَّاعَةَ؟» قَالَا: الْجُوعُ يَا رَسُولَ اللهِ،، قَالَ: «وَأَنَا، وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ، لَأَخْرَجَنِي الَّذِي أَخْرَجَكُمَا، قُومُوا» الحديث[٣].

**واتە:** چی لەم كاتەدا هێناونیەتە دەرەوە؟ وتیان: لە برسیەتی دا. فەرمووی: سوێند بەو كەسەی گیانی منی بەدەستە منیش لەبەر ئەوە

---

(١) رواه البخاري (٢٣٧٨)، ومسلم (٢٩٧٠، ٥٢٦٠)، وأحمد (٢٥٦٩١، ٢٥٨٣٣).

(٢) عورووەی كوڕی زوبێر كوڕی ئەسمای خوشكی عائیشە بوو، هەردووكیان كچی ئەبوبەكری صدیق بوون خوا لەهەموویان ڕازی بێت.

(٣) رواه مسلم (٢٠٣٨)، والترمذي (٢٢٧٢)، وفي " رياض الصالحين " ص٢٢٤ باب فضل الجوع.

هاتووم کە ئێوە لەبەری هاتوون. دوای ئەوە چوون بۆ ماڵی (ئەبوئەیوبی ئەنصاری) ﷺ لەوێ خواردنیان بۆ ئامادەکراو نانیان خوارد.

١٠- (ئەبو بوردە) دەڵێت: چووینە لای عائیشە ﷺ کراسێکی درێژی تا سەر ئەژنۆی پیشان داین زۆر زبرو ڕەق و قورس بوو وتی: «قُبِضَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي هَذَيْنِ الثَّوْبَيْنِ»[1].

واتە: پێغەمبەر ئەمانەی لەبەر دەکرد تا کۆچی دوایی کرد.

١١- ئەگەر دەوڵەمەندی بە سوپاسگوزاری خواوە باشتر بوایە لە هەژاری بە ئارامگرتنەوە ئەوا پێغەمبەری خوا هەڵی دەبژارد بۆ خۆی بەو ژیانە کەم دەستییە نەدەژیا. وە هیچ هەڵنابژێرێ تا خوا بۆی هەڵنەبژێرێ و بە خێرو باشی نەزانێ بۆی، چونکە خۆشەویستترین دروستکراویەتی.

١٢- ئیمامی (ئەحمەد) ﷺ ئەگێڕێتەوە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: «... وَخَيْرُ الرِّزْقِ مَا يَكْفِي»[2].

---

(١) رواه البخاري (٥١٨)، ومسلم (٢٠٨٠)، وأحمد (٢٤٠٣٧)، وأبو داود (٣٥٠٠).

(٢) رواه أحمد (١٤٧٧)، وفي " ضعيف الجامع " برقم (٢٨٨٧)، ولكن بلفظ: «خير الرزق الكفاف». صحيح في " سلسلة الأحاديث الصحيحة " برقم (١٨٣٤).

واتە: باشترین خۆراك ئەوەیە بە ئەندازەی پێویستی خۆت بێت، وە باشترین زیکرو یادی خوا ئەوەیە کە بە نهێنی بکرێت.

١٣- وە پێغەمبەری خوا دەفەرموێت: «إِذَا رَأَيْتَ اللهَ يُعْطِي الْعَبْدَ مِنَ الدُّنْيَا عَلَى مَعَاصِيهِ مَا يُحِبُّ، فَإِنَّمَا هُوَ اسْتِدْرَاجٌ»[١].

واتە: ئەگەر بینیتان یەکێك لەسەر تاوان بەردەوام بوو وە خواش ماڵ و سامانی پێ دەبەخشێت ئەوە لە خۆشەویستی دا نییە کە پێی دەبەخشێت بەڵکو ڕۆچوونە لە تاوان دا (الإستدراج) دوای ئەوە ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿فَلَمَّا نَسُوا۟ مَا ذُكِّرُوا۟ بِهِۦ فَتَحْنَا عَلَيْهِمْ أَبْوَٰبَ كُلِّ شَىْءٍ﴾ [الأنعام: ٤٤]. ئەگەر یادو فەرمانی خوایان لەبیر چوو وە بەڕێوەیان نەبرد ئەوا خوا دەرگای هەموو شتێکیان بۆ دەکاتەوە چی داوا بکەن پێیان دەبەخەشێ بۆ ئەوەی سەقاڵ بن تا کاتی مردن.

١٤- ئیمامی (ئەحمەد) رَحِمَهُ اللَّهُ دەگێڕێتەوە: ڕۆژێك پێغەمبەر ﷺ نوێژی ئەکرد بەکۆمەڵ بۆ یاوەرەکانی، کە لە نوێژەکە بووەوە یەکێك لە ڕیزی دواوە بەدەنگی بەرز وتی: ئەی پێغەمبەری خوا خورما سکی سوتاندووین واتە ئەوەندەمان خواردووە، کە پێغەمبەر ﷺ گوێی لەمە

(١) رواه أحمد في الزهد ص١٧، والترمذي (٢٠٣٦)، و" الصحيحة " (٤١٣).

بوو وتاریێکی بۆ دان فەرمووی: «وَاللهِ: لَوْ وَجَدْتُ خُبْزًا، أَوْ لَحْمًا لَأَطْعَمْتُكُمُوهُ، أَمَا إِنَّكُمْ تُوشِكُونَ أَنْ تُدْرِكُوا، وَمَنْ أَدْرَكَ ذَاكَ مِنْكُمْ أَنْ يُرَاحَ عَلَيْكُمْ بِالْجِفَانِ، وَتَلْبَسُونَ مِثْلَ أَسْتَارِ الْكَعْبَةِ ». قَالُوا: يَا رَسُولَ فَنَحْنُ الْيَوْمَ خَيْرٌ أَوْ يَوْمَئِذٍ؟ قَالَ: «أَنْتُمُ الْيَوْمَ خَيْرٌ مِنْكُمْ يَوْمَئِذٍ يَضْرِبُ بَعْضُكُمْ رِقَابَ بَعْضٍ»[1].

**واتە:** سوێند بەخوا ئەگەر گۆشت و نانم هەبوایە دەرخواردم دەدان، بەڵام کاتێك دێت بەسەرتان دا خواردنێکی زۆری پڕ لە لەگەن بە بەیانی و ئێواران دا، وە خانووەکانیان دائەپۆشن وەك دیواری کەعبە. وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو ڕۆژە باشە بۆ ئێمە یاخود ئەم ڕۆژە؟ فەرمووی: ئەمڕۆ خێرو باشترە لەو ڕۆژە (دووجار فەرمووی) وە فەرمووی: لەو ڕۆژە کوشتن و بڕین لە ناویان دا بڵاو دەبێتەوە.

---

(١) رواه أحمد (١٥٩٨٨)، وصححه سليم الهلالي في " تحقيق عدة الصابرين " ص٣٢٤، وفي " الآحاد والمثاني " لابن أبي عاصم (٣/ ١١٢)، والحاكم في " المستدرك " (٨٦٤٨).

**١٥- وە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: «إِنَّ لِكُلِّ أُمَّةٍ فِتْنَةً وَفِتْنَةُ أُمَّتِي المَالُ»[(١)].**

**واتە: بۆ هەموو گەلێك فیتنەیەك هەیە كە مایەی لەناوچوونیانە، فیتنەو هۆی لەناوچوونی گەلی من سامان وماڵە.**

**١٦- ئەگێڕنەوە (ئەبو عوبەیدە) ﵁ بە شتومەك و ماڵێكی زۆرەوە گەڕایەوە مەدینە خەڵكی بیستیان (ئەبو عوبەیدە) بە شت و مەكەوە لە بەحرەین گەڕاوەتەوە هەموویان نوێژی بەیانی لە مزگەوت بوون دوای نوێژ پێغەمبەر بینی زۆر هاتوون بۆ مزگەوت زەردەخەنەیەك گرتی و فەرمووی: «أَظُنُّكُمْ قَدْ سَمِعْتُمْ أَنَّ أَبَا عُبَيْدَةَ قَدْ جَاءَ بِشَيْءٍ؟»، قَالُوا: أَجَلْ يَا رَسُولَ اللَّهِ، قَالَ: «فَأَبْشِرُوا وَأَمِّلُوا مَا يَسُرُّكُمْ، فَوَاللَّهِ لاَ الفَقْرَ أَخْشَى عَلَيْكُمْ، وَلَكِنْ أَخْشَى عَلَيْكُمْ أَنْ تُبْسَطَ عَلَيْكُمُ الدُّنْيَا كَمَا بُسِطَتْ عَلَى مَنْ كَانَ قَبْلَكُمْ، فَتَنَافَسُوهَا كَمَا تَنَافَسُوهَا وَتُهْلِكَكُمْ كَمَا أَهْلَكَتْهُمْ»»[(٢)].**

---

(١) رواه الترمذي (٢٣٣٦)، وفي " الصحيحة " (٥٩٤)، و " رياض الصالحين " ص٢١٩ باب: فضل الزهد.

(٢) رواه البخاري (٦٤٢٥)، ومسلم (٢٩٥).

واتە: وابزانم بیستوتانە ئەبو عوبەیدە بە شتومەکی زۆرەوە لە بەحرەین گەڕاوەتەوە؟! وتیان: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا، فەرمووی: مژدە بدەن وە چیتان پێ خۆشە ببەن، سوێند بە خوا لە هەژاری ناترسم بەسەرتانەوە بەڵام دەترسم دونیاتان بۆ بکرێتەوە، وە ماڵ و سامانتان زۆر بێت ئێوەش هەموو دەم لە هەوڵدان دا بن بۆی وەکو گەلانی پێشوو تیاچوون بەهۆی ماڵ و دونیاوە.

١٧- ئەگێڕنەوە ڕۆژێك پیاوێکی دەوڵەمەند تێپەڕ بوو بەلای پێغەمبەر و یاوەرەکانی دا، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: «مَا تَقُولُونَ فِي هَذَا؟» قَالُوا: حَرِيٌّ إِنْ خَطَبَ أَنْ يُنْكَحَ، وَإِنْ شَفَعَ أَنْ يُشَفَّعَ، وَإِنْ قَالَ أَنْ يُسْتَمَعَ، قَالَ: ثُمَّ سَكَتَ، فَمَرَّ رَجُلٌ مِنْ فُقَرَاءِ الْمُسْلِمِينَ، فَقَالَ: «مَا تَقُولُونَ فِي هَذَا؟» قَالُوا: حَرِيٌّ إِنْ خَطَبَ أَنْ لاَ يُنْكَحَ، وَإِنْ شَفَعَ أَنْ لاَ يُشَفَّعَ، وَإِنْ قَالَ أَنْ لاَ يُسْتَمَعَ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: «هَذَا خَيْرٌ مِنْ مِلْءِ الأَرْضِ مِثْلَ هَذَا»[١].

واتە: چی دەڵێن دەربارەی ئەم پیاوە؟ وتیان: ئەگەر بچێت بۆ داوای ئافرەت دەیدەنێ و تکا بکات تکای دەگیرێت و هەرچییەکیش

---

(١) رواه البخاري (٥٠٩١).

بلێت گوێی لێدەگیرێت. دوای ئەوە هەژارێك تێپەڕ دەبێت، پێغەمبەر فەرمووی: چی دەڵێن دەربارەی ئەمە؟ وتیان: ئەگەر بچێت بۆ داوای ئافرەت نایدەنێ، وە تکا بکات تکای ناگیرێت، وە هەرچیەکیش بلێت گوێی لێناگیرێت. پێغەمبەر فەرمووی: ئەمە پڕ بە زەوی خێری زیاترو چاکترە لە هاوشێوەی ئەو.

١٨- هەروەك پێغەمبەر ﷺ بە هەژارە مەککییەکان (أهل الصفة)[١] ی فەرموو: «لَوْ تَعْلَمُونَ مَا لَكُمْ عِنْدَ اللهِ لَأَحْبَبْتُمْ أَنْ تَزْدَادُوا فَاقَةً وَحَاجَةً»[٢].

واتە: ئەگەر ئەتانزانی چۆنن لای خوا حەزتان دەکرد ئەوەندەی تر هەژارو کەمدەست بن.

وە پێغەمبەری خوا ﷺ مژدەیەکی داوە بە هەژارەکان کە نەیداوە بە دەوڵەمەندەکان و فەرموویەتی: «يَدْخُلُ فُقَرَاءُ الْمُؤْمِنِينَ الْجَنَّةَ قَبْلَ أَغْنِيَائِهِمْ بِخَمْسِ مِائَةِ عَامٍ»[٣].

(١) مەبەست لەو هەژارانەیە کە پێغەمبەر لە گۆشەیەکی مزگەوت دا جێگای بۆ کردبوونەوە، وە لەبەر بێ کەسی و پارەو ماڵ کۆچەرییەکانی مەککە بوون کەسیان نەدەناسی.

(٢) رواه الترمذي (٢٣٦٨)،وأحمد (٢٥٢٠١)، وابن حبان (٧٢٤)، رياض الصالحين (٥١٤).

(٣) سبق تخريجه ص٧١.

واتە: موسڵمانە هەژارەکان دەچنە بەهەشتەوە پێش دەوڵەمەندەکان بە نیو ڕۆژ ئەویش پێنج سەد ساڵە.

ئەوەندەمان بەسە کە پێغەمبەری خواش ﷺ مژدەی بەهەشتی پێداوین کە زۆری دانیشتوانی بەهەشت هەژارەکانن وەك دەفەرموێت: «اطَّلَعْتُ فِي الجَنَّةِ فَرَأَيْتُ أَكْثَرَ أَهْلِهَا الفُقَرَاءَ ...»[(١)].

واتە: سەیری بەهەشتم کرد زۆری بەهەشتییەکان هەژارەکانن.

**١٩-** ڕۆژێك (عبدالرحمن ی کوڕی عەوف) رضي الله عنه بەڕۆژوو بوو هەندێك خواردنیان بۆ هێنا وتی: «قُتِلَ مُصْعَبُ بْنُ عُمَيْرٍ وَهُوَ خَيْرٌ مِنِّي، كُفِّنَ فِي بُرْدَةٍ: إِنْ غُطِّيَ رَأْسُهُ بَدَتْ رِجْلاَهُ، وَإِنْ غُطِّيَ رِجْلاَهُ بَدَا رَأْسُهُ، وَأُرَاهُ قَالَ: وَقُتِلَ حَمْزَةُ وَهُوَ خَيْرٌ مِنِّي، ثُمَّ بُسِطَ لَنَا مِنَ الدُّنْيَا مَا بُسِطَ، أَوْ قَالَ: أُعْطِينَا مِنَ الدُّنْيَا مَا أُعْطِينَا، وَقَدْ خَشِينَا أَنْ تَكُونَ حَسَنَاتُنَا عُجِّلَتْ لَنَا، ثُمَّ جَعَلَ يَبْكِي حَتَّى تَرَكَ الطَّعَامَ»[(٢)] [(٣)].

---

(١) رواه البخاري (٣٠٠٠)، ومسلم (٤٨٩٨).

(٢) (٣) رواه البخاري (٤٠٤٥) عن ابن عبدالرحمن بن عوف. **عبدالرحمن** رضي الله عنه مەبەستی ئەم ئایەتە بوو ﴿أَذْهَبْتُمْ طَيِّبَاتِكُمْ فِي حَيَاتِكُمُ الدُّنْيَا وَاسْتَمْتَعْتُم بِهَا﴾.

واتە: (موصعەبی کوڕی عومەیر) شەهید بوو زۆر لەمن باشتر بوو کفن کرا بە پارچە قوماشێك سەریان پێ دائەپۆشی قاچی دەردەکەوت، قاچیان دائەپۆشی سەری دەردەکەوت، وە (حەمزە)ش بە پارچە قوماشێك کفن کرا لەمن باشتر بوو دوای ئەوان بەم شێوەیە دونیا بۆ ئێمە زۆر بوو تا وامان لێهاتووە ئەترسین ئەم ماڵ و سامانە بەش و پاداشتی کردەوەکانمان بێت لە دونیادا دوای ئەمە ئەوەندە گریا خواردنەکەی بۆ نەخورا.

نەك هەر (عبدالرحمن ی کوڕی عەوف) کوڵی دەروونی لەم بارەیەوە کوڵا بێت بەڵکو (ئەبوبەکرو عومەرو عوسمان و عەلی و ئەبوعوبەیدەو عەممارو سەلمان و عبداللە ی کوڕی مەسعود و عائیشە) ﷺ هەموویان بەو شێوەیە یادی دوا ڕۆژو بوونی سامانی ئەم دونیایەیان کردووەتەوەو کوڵەی دەروونیان هاتووەو گریاون کە لە چەندەها پەرتوك دا ووتەکانیان نوسراوتەوە کە دەفەرموون:

- وەکو (محمدی کوڕی عطاء) ﷺ دەڵێت: ڕۆژێ لەگەڵ (ئەبوبەکر)دا ﷺ دانیشتین باڵدارێکی بینی فەرمووی: «طُوبَى لَكَ يَا طَيْرُ تَطِيرُ فَتَقَعُ عَلَى الشَّجَرِ، ثُمَّ تَأْكُلُ مِنَ الثَّمَرِ، ثُمَّ تَطِيرُ لَيْسَ عَلَيْكَ حِسَابٌ وَلَا عَذَابٌ يَا لَيْتَنِي كُنْتُ مِثْلَكَ، وَاللهِ لَوَدِدْتُ أَنِّي كُنْتُ

شَجَرَةً إِلَى جَانِبِ الطَّرِيقِ فَمَرَّ عَلَيَّ بَعِيرٌ فَأَخَذَنِي فَأَدْخَلَنِي فَاهُ فَلَاكَنِي» (١).

**واتە:** مژدە هەر بۆ تۆ بێت لەو دارە دەخۆیت و ئەیکەیت بە ڕیقنەو هیچ لێپرسینەوەیەکت لەسەر نییە، خۆزگە من لەشوێنی تۆ بوومایە. وتم: تۆ وا دەڵێیت کە هاوڕێی پێغەمبەر ﷺ بوویت!

• هەروەك كاتێ كە سامان و پارەو ماڵەكەی كیسرایان هێنا بۆ لای ئیمامی (عومەر) رضي الله عنه كاتێ ئەو هەموو پارەو ماڵەی بینی دەستی كرد بە گریان، (عبدالرحمن ی كوڕی عەوف) وتی: «مَا الَّذِي يَبْكِيكَ يَا أَمِيْرَ الْمُؤْمِنِيْنَ؟ فَوَاللهِ أَنَّ هَذَا لَيَوْمُ شُكْرٍ وَيَوْمُ سُرُوْرٍ وَيَوْمُ فَرَحٍ، فَقَالَ عُمَرْ: إِنْ هَذَا لَمْ يُعْطِيْهِ قَوْمٌ إِلاَ أَلْقَى اللهُ بِهِمْ الْعَدَاوَةُ وَالْبَغْضَاءُ»(٢).

**واتە:** ئەی ئەمیری موسوڵمانان بۆ دەگریت؟ ئەمە ڕۆژی خۆشی و سوپاسی خواو مژدەیە، ئیمامی (عومەر) فەرمووی: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (هەركۆمەڵێك ئەمانە كەوتنە ناویان خوا هەر دووبەرەكایەتی و ڕق و كینە دەخاتە نێوانیان).

---

(١) ابن المبارك في " الزهد " (٢٤٠)، والبيهقي في " الشعب " (٣/ ٧٦).

(٢) عبدالله بن أحمد في " زوائد الزهد " ص١٤٣.

ئەمە مایەی ماڵ و سامانە هەروەك بەم شێوەیەی خوارەوە پێغەمبەر ﷺ باسی شێوازی دونیاو ماڵ و سامان دەکات، ئەگەر ماڵ و سامانی دونیا شوێنی ڕێز بوایە لای خوا فەرمانی نەدەدا بە دوور کەوتنەوەی و بوونە مایەی دووبەرەکایەتی، بەڵکو فەرمانی داوە بە ئارامگرتن تیایدا، وە دونیا زیندانی موسوڵمانە، وەك پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: «الدُّنْيَا سِجْنُ الْمُؤْمِنِ، وَجَنَّةُ الْكَافِرِ»[(١)].

واتە: دونیا بەندیخانەی موسوڵمانەو بەهەشتی کافرە. واتە دونیا بەهەشتە لەچاو سزای سەختی دواڕۆژدا بۆ بێبڕواکان.

وە دەفەرموێت: «لَوْ كَانَتِ الدُّنْيَا تَعْدِلُ عِنْدَ اللهِ جَنَاحَ بَعُوضَةٍ مَا سَقَى كَافِرًا مِنْهَا شَرْبَةَ مَاءٍ»[(٢)].

واتە: ئەگەر ڕێزی هەبوایە لای خوا بە ئەندازەی باڵە مێشێك نەیدەهێشت کافر قومێك ئاوی لێ بخوات.

وە دەفەرموێت: وَقَفُوا مَعَ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَلَى السَّخْلَةِ الْمَيِّتَةِ، ... قَالَ: «فَالدُّنْيَا أَهْوَنُ عَلَى اللهِ مِنْ هَذِهِ عَلَى أَهْلِهَا»[(٣)].

---

(١) رواه مسلم (٥٢٣٤)، والترمذي (٢١١٠).

(٢) رواه الترمذي (٢٣٢٠) وقال حديث صحيح، وابن ماجه (٤١١٠).

(٣) رواه الترمذي (٢٣٢١) وصححه الألباني.

واتە: دونیا لای خوا وەکو مردارەوەبوویەك وایە کە لە زبڵدان دا فڕێی دەدەن.

وە دەفەرموێت: «مَا الدُّنْيَا فِي الآخِرَةِ إِلَّا مِثْلُ مَا يَجْعَلُ أَحَدُكُمْ إِصْبَعَهُ فِي اليَمِّ فَلْيَنْظُرْ بِمَاذَا يَرْجِعُ»[١].

واتە: دونیا وەکو دلۆپێك ئاو وایە لە دەریایەك.

وە دەفەرموێت: «أَلَا إِنَّ الدُّنْيَا مَلْعُونَةٌ مَلْعُونٌ مَا فِيهَا إِلَّا ذِكْرُ اللهِ وَمَا وَالَاهُ وَعَالِمٌ أَوْ مُتَعَلِّمٌ»[٢].

واتە: هەموو دونیا مایەی زیان و خراپەو دوورییە لە خوا بێجگە لە یادی خواو زاناو زانیاری نەبێت.

وە دەفەرموێت: «كُنْ فِي الدُّنْيَا كَأَنَّكَ غَرِيبٌ أَوْ عَابِرُ سَبِيلٍ» وَكَانَ ابْنُ عُمَرَ، يَقُولُ: «إِذَا أَمْسَيْتَ فَلاَ تَنْتَظِرِ الصَّبَاحَ، وَإِذَا أَصْبَحْتَ فَلاَ تَنْتَظِرِ المَسَاءَ ...»[٣].

واتە: فەرمانی داوە کە موسوڵمان وەك ڕێڕەو وابێت تیایدا ئەگەر

---

(١) رواه الترمذي (٢٣٢٣)، وفي " صحيح سنن ابن ماجه " برقم (٣٣١٦).

(٢) رواه الترمذي (٢٣٢٢) وحسنه الألباني، وابن ماجه (٤٠٩٤).

(٣) رواه البخاري (٦٤١٦).

بەیانی کردەوە بەتەمای ئێوارە نەبێت وە ئێوارەی کردەوە بەتەمای بەیانی نەبێت.

وە دەفەرموێت: «تَعِسَ عَبْدُ الدِّينَارِ، وَالدِّرْهَمِ، ...»[(١)].

واتە: دوعای کردووە لەوانەی بەندەی دونیاو درهەمن.

وە دەفەرموێت: «إِنَّ الدُّنْيَا حُلْوَةٌ خَضِرَةٌ، ...»[(٢)].

واتە: دونیای کردووە بە وێنەی سەوزێکی شیرین.

وە دەفەرموێت: «مَا لِي وَلِلدُّنْيَا، مَا أَنَا فِي الدُّنْيَا إِلَّا كَرَاكِبٍ اسْتَظَلَّ تَحْتَ شَجَرَةٍ ثُمَّ رَاحَ وَتَرَكَهَا»[(٣)].

واتە: هەواڵی داوە خۆی یەکێکە لەوانەی لە دونیادا ئەژین وەکو ڕێڕەوێك وایە لەژێر سێبەری دارێك دا تۆزێك پشوو دەدات و دوایی دەڕۆن و بەجێی دەهێڵێت.

وە دەفەرموێت: «... فَلْيَنْظُرْ إِلَى مَنْ هُوَ أَسْفَلَ مِنْهُ»[(٤)].

واتە: فەرمانی داوە دەبێت لە ژیانی دونیادا سەیری لە خوار

---

(١) رواه البخاري (٢٨٨٦).

(٢) رواه مسلم (٢٧٤٢)، والترمذي (٢١٩١).

(٣) رواه الترمذي (٢٣٧٧)، وابن ماجه (٤١٠٩).

(٤) رواه البخاري (٦١٣٠)، ومسلم (٥٢٤١).

خۆتەوە بکەیت.

وە هیچ شتێك ئامانجی دونیا نییە بێجگە لە بەڵاو خراپەو دووبەرەکایەتی نەبێت.

وە دەفەرمویێت: «... فَاتَّقُوا الدُّنْيَا ... »[١].

واتە: هەواڵی داوە بە ڕزگاربوونی ئادەمیزاد لە دونیادا بە دوورکەوتنەوەو پتەوکردنی ئیمانی.

وە هەموو جار دەیفەرموو: «إِنَّ اللهَ يَحْمِي عَبْدَهُ الْمُؤْمِنَ الدُّنْيَا وَهُوَ يُحِبُّهُ كَمَا تَحْمُونَ مَرِيضَكُمُ الطَّعَامَ وَالشَّرَابَ تَخَافُونَ عَلَيْهِ»[٢].

واتە: خوا ئەگەر بەندەیەکی خۆش بویێت دەیپارێزێت لە دونیا وەکو چۆن نەخۆشێك ئەپارێزێت لە خواردن و خواردنەوە کە زیانی پێدەگەیەنێت.

وە دەیفەرموو: «إِنَّ مَطْعَمَ ابْنِ آدَمَ ضُرِبَ لِلدُّنْيَا مَثَلًا بِمَا خَرَجَ مِنِ ابْنِ آدَمَ، وَإِنْ قَزَّحَهُ، وَمَلَّحَهُ، فَانْظُرْ مَا يَصِيرُ إِلَيْهِ»[٣].

واتە: نموونەی گێڕاوە بە کۆتایی خۆراکێکی زۆر خۆش کە

---

(١) رواه مسلم (٤٩٠٣)، والترمذي (١٦٢٤)، وابن ماجه (٣٩٨٢).

(٢) رواه الترمذي (٢٠٣٦)، وأحمد (٢٤٨٣٥).

(٣) رواه ابن حبان (٧٢٠)، وأحمد (٢١٢٣٩)، وفي " الصحيحة " برقم (٣٨٢).

ئادەمیزاد دەیکات بە پاشەڕۆك وە لە پێش دا چەندە بەتام و بۆن خۆشە، لە کۆتاییش دا چەندە بۆنی پیسە، دونیا وەك ئەو خواردنە وایە.

وە سەلەف فەرموویانە: سەری هەموو هەڵەو تاوانێك خۆشەویستی دونیایە[١].

ئەمانە هەموو حاڵ و چۆنیەتی ژیانی دانیشتوانی دونیان لەچاو ڕۆژی دوایی دا.

## دونیا بەشێوەی نمونە

(ابن القیم)[٢] رحمه الله سەرەتاو کۆتایی و ئامانجی دونیا بەشێوەی چەند نمونەیەك باس دەکات بەم شێوانەی خوارەوە:

### نمونەی یەکەم/

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: «مَا لِي وَلِلدُّنْيَا، مَا أَنَا فِي الدُّنْيَا إِلَّا كَرَاكِبٍ اسْتَظَلَّ تَحْتَ شَجَرَةٍ ثُمَّ رَاحَ وَتَرَكَهَا»[٣].

---

(١) عبدالله بن أحمد في " الزهد " ص٩٢، وأبو نعيم في " الحلية "، والبيهقي في " الزهد "، وابن تيمية في " الفتاوى " (٢/ ١٩٦)، و (١١/ ٩٠٧).

(٢) لە کتێبی " عدة الصابرين " ص٣٦١ تا ٣٨٥.

(٣) سبق تخريجه ص٩٦.

واتە: نمونەی من و دونیا وەك ڕێبوارێك وایە لـەژێر سێبەری دارێك دا کەمێك پشوو بدات و دوای ئەوە هەڵسێت و جێی بهێڵێت.

دونیا وەك سێبەری ئەو دارە وایە کە ماوەیەك ئەمێنێتەوەو دوایی کۆتایی پێدێت، کەواتە سێبەر شایستەی ئەوە نییە خانووبەرەو شتومەکی تیادا بنیاد بنرێت.

وە دەفەرموێت ﷺ: «مَا الدُّنْيَا فِي الآخِرَةِ إِلَّا مِثْلُ مَا يَجْعَلُ أَحَدُكُمْ إِصْبَعَهُ فِي اليَمِّ فَلْيَنْظُرْ بِمَاذَا يَرْجِعُ»(١).

واتە: ڕۆژی دونیا لـەچاو ڕۆژی کۆتایی دا وەك ئەوە وایە پەنجە بخەیتە دەریایەکەوە دوای ئەوە دەریبێنیت و سەیری بکەیت چەند ئاوی لـەگەڵدا دێتە دەرەوە.

بێگومان دڵۆپێك و دوو دڵۆپی ئاوی پێوە دێتە دەرەوە واتە دونیا بەو ئەندازەیەیە.

## نمونەی دووەم/

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: «إِنَّ مَطْعَمَ ابْنِ آدَمَ ضُرِبَ لِلدُّنْيَا مَثَلًا بِمَا خَرَجَ مِنِ ابْنِ آدَمَ، وَإِنْ قَزَّحَهُ، وَمَلَّحَهُ، فَانْظُرْ مَا يَصِيرُ إِلَيْهِ»(٢).

---

(١) سبق تخريجه ص٩٥.

(٢) سبق تخريجه ص٩٧.

واتە: دونیا وەك ئەو خۆراك و خواردنە ڕازاوەیەی دونیا وایە کە ئادەمیزاد ئەی خوات و ئەبێت بەو پاشەڕۆکە هەتا خواردنەکە بەتام و خۆشتر و بەلـەزەتتر بێت زیاتر پاشماوەکەی پیستر دەبێت.

وە هەندێك لـە پێشووە صالّحەکان زۆرجار ئەیانفەرموو: (با بڕۆین دونیاتان پیشان بدەین، ئەیانبردن بۆ سەر زبلّدان و ئەیان وت سەیر بکەن ئەوە میوەو مریشك و هەنگوین و چەورابیەکانتانە).

## نمونەی سێیەم/

وەکو پاپۆڕێك وایە کۆمەلّێکی تیادا سوار بووبێت وە ڕێگەیان بکەوێتە نیوە دوورگەیەکەوە، خاوەن پاپۆڕ کە بلّێت بە خەلّکەکە بۆ پشوودان کەمێك لا ئەدەینە ئەو دوورگەو وشکانییە بەلاّم ئاگادارابن و دوانەکەون لـەکاتی خۆی تاوەکو پاپۆڕەکە بەجێتان نەهێلّێت، کاتێك پاپۆڕەکە لایدایە دوورگەکە خەلّکەکە بلاّوبوونەوە بە باخ و بێستانەکان و بەرزی و نزمی و کانیاوی دورگەکەدا، ماوەیەکی پێچوو هەندێکی کەمیان لـە ترسی ئەوەی پاپۆڕەکە بەجێیان نەهێلّێت زوو گەڕانەوە بۆ ناو پاپۆڕەکەو شوێنی باش و فراوانیان گرت و هەندێکیشیان سەرقالّ بوون بە سەیرکردنی گولّ و گولّزارو دەنگی ئەو بالّندەکانەوە کە دەیان خوێند، وە بە کۆکردنەوەی بەردی هەمەڕەنگ و جوان، بەلاّم لـەپڕ بەبیریاندا هاتەوە کە پاپۆڕەکە بەجێیان

دەهێڵێت ئەگەر دوا بکەون، بەپەلە گەڕانەوەو بە باوەشیانەوە کۆمەڵێك گوڵ و بەروبووم و میوەیان پێیە کاتێك گەڕانەوە بۆ ناو پاپۆڕەکە بینیان شوێنی باشیان بۆ نەماوە تەنانەت ئەو شتانەی پێیانە جێگای نییە دایبنێن ناچار دەیانخستە باوەشیان و سەر ملیان وە پەشیمان بوونەوە بەهێنانی ئەو شتانە و سیس و زەرد و بۆگەن هەڵگەڕان، بەڵام کۆمەڵێکی تریان زۆر دوور کەوتبوونەوە لە دوورگەکە، بەردەوام دەگەڕان بۆ سەیرکردنی چڕی ئەو ناو باخ و گوڵزارانەی تیایەتی، لەم کاتەدا پاپۆڕەوانەکە بە دەنگی بەرز هاواری کردو شاوری گەڕانەوەی لێدا، بەڵام بەهیچ شێوەیەك گوێیان لێ نەبوو، لەبەر ئەوەی زۆر دوور کەوتبوونەوە، وە سەرقاڵ بوون بە بۆنی ئەم گوڵ و ڕاکێشانی ئەم چڵ و هەردەمە تامی جۆرە میوەیەك، وە گوێگرتن لەو باڵندەو لەگەڵ ترسێکی زۆر لە مارو دووپشك و شێرو ئاژەڵە دڕندەکان کە زیانیان پێبگەیەنن، لەدوای ئەوە پاپۆڕەکە دەمێك کەوتبووە ڕێ و دوور کەوتبووەوە بەڵام ئەم کۆمەڵە هەر نەهاتەوە بیریان نە پاپۆڕو نە سەفەر، تا وایان لێهات هەندێکیان هاتنەوە سەر ڕووبارەکە سەیریان کرد دەمێکە پاپۆڕەکە ڕۆیشتووە ئەوان بێئاگا بوون لێی هەتا هەموویان مردن، وە هەندێکیشیان لەناو چڕی دارستانی دوورگەکە دڕندە لەناوی بردن، وە هەندێـکیشیان بێ سەرو

شوێن بوون.

ئەمانە هەمووی نمونەی دونیان ئەوانەی یەکەمجار گەڕانەوە بۆلای پاپۆڕەکەو شوێنی باشیان گرت ئەوانە هیچ گرنگییەکیان بە دونیا نەداو سەرفراز بوون، وە ئەوانەش دووەمجار گەڕانەوە بە شت و مەکەکانیانەوە کە هێنابوویان ڕزگاریان بوو بەڵام کردەوەی خراپیان هەبوو کە بوو بە بۆگەن بەسەریانەوە، وە ئەوانەی کۆتایی بە بێسەرو شوێن نەگەڕانەوە تیایدا مردن و لەناوچوون ئەوانە بوون گرنگیان بە دونیا ئەدا تا دونیا لەناوی بردن بە بریق و باقەکەیەوە سەرقاڵی کردبوون لە هەموو بیرکردنەوەیەك.

## نموونەی چوارەم/

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: نمونەی من و دونیا وەکو کۆمەڵێك وایە کۆچ دەکەن بە شوێنێکی زۆر دووردا هەر ناگەنە ئاوەدانی تا وایان لێدێت هیچ هیوایەکیان نامێنێت و نان و ئاویان کەمێك پێ ماوە نازانن بیخۆن یاخود نەیخۆن ڕێگا ماوە یان نەماوە تا بگەنە ئاوەدانی، لەم کاتەدا پیاوێکیان لێ دەردەکەوێت لە دوورەوە ئەوانیش دەڵێن دیارە نزیك بووینەتەوە لە ئاوەدانی کە پیاوەکە ئەگاتە لایان پرسیاریان لێ دەکات ئەوانیش دەڵێن: ئەم شێوەیەین کە ئەمان بینیت، ئەڵێت ئەگەر بتانبەمە شوێنێك کانیاو سەوزە بێت چیم دەربارە دەکەن؟ وتیان

هەرگیز لە قسەت لانادەین. ئەڵێت باشە پەیمان ئەدەن بە خوا کە ڕاست دەکەن؟ ئەوانیش پەیمان ئەدەن بە خوا بە هیچ شێوەیەك لە قسەی لانەدەن، پاشان ئەیان گەیەنێتە شوێنی سەوزەو کانیاو ماوەیەك تیایدا دەمێننەوە دوای ئەوە پێیان دەڵێت ئەی خەڵکی خۆتان ئامادەکەن بۆ کۆچکردن. ئەوانیش دەڵێن: بۆ کوێ؟ ئەویش دەڵێت: بۆ لای ئاوێك و کانیاوێك و سەوزاییەك زۆر خۆشتر و دڵگیرتر بێت لێرە، زۆربەی کۆمەڵەکە دەڵێن بەخوا شوێنی وامان دەست ناکەوێت و بەتەما نەبووین ئەمەشمان دەست کەوێت ژیانێکمان ناوێت لەمە باشتر بێت! وە لەو کۆمەڵە کەمێکیان ئەمێننەوەو ئەڵێن: ئەی ئێوە نەبوون پەیمانتان دا بە خوا لە قسەی ئەم پیاوە دەرنەچن؟ یەکەمجار ڕاستی نەکرد ئێمەی هێنا بۆ ئێرە؟ ئەمجارەش هەر ڕاست دەکات وەکو یەکەمجار! ئەو کۆمەڵە کەمەی بەگوێی پیاوەکەیان کرد لەگەڵیا ڕێکەوتن و کۆچیان کرد، ئەوانەش کە مانەوە زۆر بوون ماوەیەك مانەوە تا دوژمن هێرشی بۆ هێنان و زۆریان کوژران، ئەوەشی کە مایەوە بەدیل گیران[١].

لەم نمونەیەدا پێغەمبەر ﷺ وەکـو ئەو پیاوە وایە کە ئەمانی برد بۆ

---

(١) ابن أبي الدنيا في " ذم الدنيا " ص٨٨، وابن المبارك في " الزهد " (٥٠٧)، وأحمد والطبراني والبزار وفيه إنفطاع.

شوێنی باش و نەبڕاوە، وە کەمێك بەڕاستی بەگوێیان کردو دوای کەوتن و ڕزگاریان بوو، ئەوانەش کە بەگوێی ناکەن و باوەڕی پێناکەن وە گرنگیان داوە بە دونیا وەکو کۆمەڵە زۆرەکەیان بەسەردێت.

## نمونەی پێنجەم/

(موستەوریدی کوڕی شەداد) دەڵێت: من لەگەڵ ئەوانەدا بووم کە وەستابوون لەگەڵ پێغەمبەری خوا لەسەر مردارەوەبوویەك، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: «أَتَرَوْنَ هَذِهِ هَانَتْ عَلَى أَهْلِهَا حِينَ أَلْقَوْهَا»، قَالُوا: مِنْ هَوَانِهَا أَلْقَوْهَا يَا رَسُولَ اللهِ، قَالَ: «فَالدُّنْيَا أَهْوَنُ عَلَى اللهِ مِنْ هَذِهِ عَلَى أَهْلِهَا»[1].

**واتە:** ئەمە دەبینن کە زۆر پیس و بێ نرخ بووە لای خاوەنەکەی بۆیە فڕێی داوە، سوێند بەو کەسەی گیانی منی بەدەستە دونیا لای خوا لەم مردارەوە بووە پیستر و بێنرخ ترە.

لەبەر ئەوە ڕەنگە لەو مردارەوە بووە خوری و پێستەکەی یەکێك سوودی لێ وەرگرێت بەڵام دونیا ئەو سوودو نرخەشی نییە بۆیە لای خوا کەمترە.

---

(١) سبق تخريجه ص٩٤.

## نمونەی شەشەم/

نمونەی دونیا وەك خەڵك و دەریایەك وایە پێویستە لەسەر خەڵكی بە پاپۆڕی ڕزگاربوون (سفينة النجاة) بپەڕنەوە ئەوبەر كە ماڵ و شوێنی لێیە، هەندێك لە خەڵكی نەفام تا نیوەی ڕێگاكە سواری پاپۆڕەكە دەبن، لە نیوەی دا دەڵێن بە مەلەكردن دەیبڕین تا دەگەینە ئەوبەرەوە، ئەكەونە مەلەكردن هەتا هێزیان تیایە دەڕۆن دوای ئەوە هێزیان نامێنێت و ناتوانن مەلە بكەن تیا دەچن و ئەخنكێن، بەڵام ئەوانەی كە سواری پاپۆڕەكە بوون ڕزگاریان ئەبێت، وە بە مەبەستی خۆیان ئەگەن، وەكو ئەوانەی لەگەڵ پێغەمبەر (نوح)دا ﷷ وان كە بە سواری پاپۆڕەكە ڕزگاریان بوو.

لێرەدا پاپۆڕەكە وەكو پێغەمبەران سەلامی خوایان لێبێت وایە، خوا ناردوونی بۆ ڕزگاركردنی ئادەمیزاد لە تیاچوون و نوقم بوون لە تاوان، دونیاش وەكو دەریایەكە ئەوەی تیا ڕۆچێت ئەبێت بە مایەی لەناوبردنی.

## نمونەی حەوتەم/

دونیا وەكو جامێك هەنگوین وایە كە مێش دەورەی لێ ئەدەن هەندێكیان لە لێواری جامەكە ئەنیشنەوە ئەوەی مەبەستیانە لێی دەخۆن و دوایی ئەفڕن وە ئەوانەی ویستی زۆرو تەماحاوین لە لێواری

جامەکە تێر ناخۆن دەچنە ناوەڕاستی جامەکە بۆ خواردن تا وایان لێدێت نوقم دەبن و ناتوانن دەربچن.

## نمونەی هەشتەم/

کۆمەڵێك لە شوێنێك دا نیشتەجێ دەبن و ماڵ و سامانی زۆریان دەبێت وە یەکێك پەیدا دەبێت هاواریان لێ دەکات و دەڵێ: ئەی خەڵکینە بەم دوو چاوەی خۆم سوپایەکی گەورەی دوژمنم بینیوە لەودیو ئەو چاڵە هەتا زووە با دەربچین وە ئێرە بەجێ بێڵێن و ڕزگارمان بێت، زۆریان ئەڵێن چۆن ئێمە ئەم ماڵ و سامانە بەجێ بێڵێن؟ هەندێکیان بەگوێی دەکەن دەست دەکەن بە کۆچ کردن ئەوەی بۆیان بڕوات لەگەڵ خۆیان دەیبەن تا ڕزگاریان دەبێت و دەرئەچن، بەڵام ئەوانەی کە مانەوە دوژمن لەپڕ هێرشێك ئەدات بەسەریانداو هەموویان لەناو دەبەن بە خۆیان و ماڵ و سامانیانەوە.

کەواتە ئەوانەی گوێڕایەڵی پێغەمبەری خوا ناکەن ئەنجامی کارەکانیان تیاچوونە، پێغەمبەر ﷺ لە فەرموودەیەکی دا (متفق علیه)[١] نمونەی خۆی و دونیا بەم شێوەیە باس دەکات وەك دەفەرموێت: «إِنَّمَا مَثَلِي وَمَثَلُ مَا بَعَثَنِي اللهُ بِهِ، كَمَثَلِ رَجُلٍ أَتَى قَوْمًا».

---

(١) رواه البخاري (٦٤٨٢، ٧٢٨٣)، ومسلم (٢٢٨٣).

## نمونەی نۆیەم/

پێغەمبەری خوا مەسیحی کوڕی مەریەم ﷺ دونیای لە شێوەی پیرەژنێکی پیردا بینی کە هەموو جۆرە خشڵێکی پێوە بوو پرسیاری لێ کرد چەند شووت کردووە؟ وتی: لە ژمارە نایەت! فەرمووی: هەموویان مردن یاخود تەڵاقیان دایت؟ وتی: نەخێر بەڵکو هەموویانم کوشتووە، مەسیح ﷺ فەرمووی: تیاچوون بۆ ئەوانەی لەمەودوا شویان پێدەکەیت کە پەند لەوانەی پێشوو وەرناگرن و یەکە یەکە لەناویان دەبەیت و خۆیان ناپارێزن لە تۆ[(١)].

وە لە وتەیەکی تردا مەسیح ﷺ دەفەرموێت: (دونیا مەکەن بە خوای خۆتان با نەتان کات بە بەندەی خۆی، وە بزانن بناغەی هەموو تاوانێك خۆشەویستی دونیایە، ڕەنگە خۆشەویستی دنیا خەمو خەفەتێکی زۆر بە دوای دا بهێنێت، خۆشی دونیا تاڵی ڕۆژی دواییە، ڕێز مەگرن لە دونیا با لە ڕۆژی دوایی ڕێزگیراوبن، هەموو ڕۆژێکی ڕاکێشانە بۆ تیاچوون و لەناوبردن، ئەی (بەنی ئیسرائیل) ماڵەکانتان با وەك ماڵی میوان وابێت ئێوە هەر ڕێبوارن لە دونیادا، ئەی هاوەڵانم کێتان دەتوانێت لەسەر شەپۆلی ئاودا خانوو و ماڵ دروست

---

(١) ابن أبي الدنيا في " ذم الدنيا " (٢٤٩)، وأحمد في " الزهد " ص١٣٢، وأبو نعيم في " الحلية " (٢/ ٢٤٣).

بكات؟!)[١].

وە پرسیاریان لیٚ كرد وتیان: پیاوێك دەچێت بە ڕێگەیەك دا پارچە ئاڵتونێك ئەبینێت و خۆی لیٚ لائەداو هەڵی ناگرێت و پیاوێكی تریش بەو ڕێگەیەدا ئەڕوات و هەڵی دەگرێتەوە سەرفی دەكات لەپێناو خوادا كامیان باشترە؟! فەرمووی: (ئەوەیان كە ئاوڕی لیٚ ناداتەوەو هەڵی ناگرێتەوە). ئەمە فەرموودەی مەسیحە عليه السلام كە حەزی نەكردووە بە هیچ جۆرێك گرنگی بدرێت بە دونیا لەبەر ئەوە ڕەنگە ئەو ئاڵتونە ببێتە هۆی دووبەرەكایەتی و نەدرێت بە خاوەنی مافرەوای خۆی (مستحق)، وە كە ئەیاندرێتیٚ ببێتە هۆی تاوانباری، واتە بەكاری بێنن لە تاوان دا، واتە بەهۆی ئاڵتونەكەی ئەمەوە بوو تووشی تاوان بوون، كەواتە هەڵنەگرتن و ئاوڕ نەدانەوە لێی باشترە.

هەروەك پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم سامانی دونیای نەئەویست وە ئەگەر وەریشی بگرتایە سەرفی دەكرد لە پێناوی خوادا، ئەمانە هەموویان ترساندن (الترهیب)ن بۆ ئادەمیزاد، وە بۆ زۆر گرنگی نەدان بە دونیا نەك وازهێنان بە یەكجارەكی، هەروەها دونیا نموونە كراوە بە (خەو، وە ژیانی بە خەو بینینەوە، وە مردن بە هۆشكردنەوە و ئاگادار بوونەوە لە خەو)، دونیا (كێڵگەیەكە كردەوە تیایدا تۆوەكەیەتی كە ئەیچێنن وە

---

(١) ابن أبي الدنيا (٣٥٥٣١).

بەرهەمەکەی دوایی دروێنە ئەکات)، وە نمونە کراوە بە (خانوویەك دوو دەرگای هەبێت لەم دەرگایەوە دەچێتە ژوورەوە لەو دەرگایەوە دێتە دەرەوە)، وە نمونەکراوە بە (خواردنێکی بەتام و بۆن خۆش بەڵام ژەهراوی کراوە ئەوەی ئەیخوات ئەیکوژێت)، وە نموونە کراوە بە (خواردنێك دوای ئەوەی لەش سوودی خۆی لێ وەردەگرێت ئەگەر بمێنێتەوە لە لەش دا خاوەنەکەی تووشی ئێش و ئازار و ناخۆشی دەکات).

(عبدالله ی کوڕی مەسعود) رضي الله عنه دەفەرموێت: هەموو کەس لە دونیادا میوانە وە ئەوەی هەیەتی ڕاسپاردەکانیەتی، میوان لەسەر سەفەرە، ئەڕوات و ڕاسپاردەش دەدرێتەوە بە خاوەنەکەی[١].

وە یەکێك پرسیار لە پێغەمبەر ﷺ دەکات چ کردەوەیەك بکەم باشە کە خواو خەڵکی خۆشیان بوێم؟ فەرمووی: «ازْهَدْ فِي الدُّنْيَا يُحِبَّكَ اللَّهُ، وَازْهَدْ فِيمَا فِي أَيْدِي النَّاسِ يُحِبُّكَ النَّاسُ»[٢].

واتە: دوورە پەرێز بە لە دونیا خوا خۆشی دەوێیت، دوورەپەرێز بە لە داواکردن لە خەڵکی خۆشەویست دەبی لای خەڵکی.

---

(١) البيهقي في " الشعب " (١٠٦٤٤).

(٢) رواه ابن ماجه (٤١٠٢)، وفي " الصحيحة " برقم (٩٤٤).

- ئیمام (ئەحمەد) ﵀ دەگێڕێتەوە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی:

«ثَلَاثٌ أُقْسِمُ عَلَيْهِنَّ، وَأُحَدِّثُكُمْ حَدِيثًا فَاحْفَظُوهُ، قَالَ: فَأَمَّا الثَّلَاثُ الَّتِي أُقْسِمُ عَلَيْهِنَّ: فَإِنَّهُ مَا نَقَّصَ مَالَ عَبْدٍ صَدَقَةٌ، وَلَا ظُلِمَ عَبْدٌ بِمَظْلَمَةٍ فَيَصْبِرُ عَلَيْهَا إِلَّا زَادَهُ اللهُ بِهَا عِزًّا، وَلَا يَفْتَحُ عَبْدٌ بَابَ مَسْأَلَةٍ إِلَّا فَتَحَ اللهُ لَهُ بَابَ فَقْرٍ»(١).

واتە: سێ شت هەیە سوێندی لەسەر دەخۆم وە هەندێ شتتان پێ دەڵێم لەبەری بکەن ئەو سیانە سوێندی لەسەر ئەخۆم(١) هەر ماڵێك خێری لێ بکرێت کەم نابێتەوە، هەر ستەمێکیان لە بەندەیەك کردو ئارامی لەسەر گرت خوای گەورە هەر سەری دەخات و دەسەڵاتی پێ دەبەخشێت، هەر بەندەیە داوای کرد لەهەر کەسێك بۆ شتێك خوای گەورە هەر دەرگای پێویستییەکی تری لێدەکاتەوە.

وە ئەو شتانەش کە وتم لەبەری کەن دونیا بۆ چوارکەسە: بەندەیەك خوا سامان و زانینی پێ دەبەخشێت ئەو ماڵەی لە پێناوی خوا ئەبەخشێتەوەو یارمەتی خزمەکانی ئەدات، وە ئەزانێت چەندە مافی خوای تێدایە ئەی بەخشێت ئەم بەندەیە باشترین شوێنی هەیە لای خوا،

---

(١) رواه الترمذي (٢١١٥)، وابن ماجه (٤٢٢٨)، وأحمد (١٨٧٢٨).

(٢) واتە پێغەمبەر سوێندی لەسەر دەخوات کە بێگومان وایە ئامانجی ئەو سیانەیە.

وە بەندەیەك خوا زانستی پێ دەبەخشێت بەڵام ماڵی پێ نابەخشێت ئەڵێت ئەگەر ماڵم هەبوایە وەك فلاّن كەس ئەم بەخشیەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەم دووانە لە پاداشت دا یەكسانن، وە بەندەیەك خوا ماڵی پێ دەبەخشێت و زانستی پێ نابەخشێت ماڵەكەی هەروا سەرف دەكات مافی خوای تیا نادات و یارمەتی خزم و كەسی نادات ئەمە خراپترین شوێنی هەیە لای خوا، وە بەندەیەك خوا ماڵ و زانستی پێ نەبەخشیوە ئەڵێت خۆزگە ماڵم ببوایە وەكو فلاّنە كەس بم بەخشیایەتەوە بمبردایە بەرێوە "بەشدارە لەگەڵ دەوڵەمەندەكان دا بەگوێرەی نییەتی"[(١)].

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: «لَا تَزُولُ قَدَمَا عَبْدٍ يَوْمَ الْقِيَامَةِ حَتَّى يُسْأَلَ عَنْ عُمُرِهِ فِيمَا أَفْنَاهُ، وَعَنْ عِلْمِهِ فِيمَ فَعَلَ، وَعَنْ مَالِهِ مِنْ أَيْنَ اكْتَسَبَهُ وَفِيمَ أَنْفَقَهُ، وَعَنْ جِسْمِهِ فِيمَ أَبْلَاهُ»[(٢)].

**واتە:** ئادەمیزاد ڕزگاری نابێت لە ڕۆژی دوایی تا پرسیاری لێ نەكرێت لە چوار شت دا:

١ – تەمەنی لە پێناوی چی دا بردووەتە سەر.

---

(١) رواه مسلم (٢٥٨٨)، والترمذي (٢٣٢٥)، وصحيح ابن ماجه (٣٤٠٦).

(٢) رواه الترمذي (٢٤١٧) وقال حديث حسن صحيح، وفي " الصحيحة " (٩٤٦).

٢- وە کاتی گەنجیەتی لە پێناوی چی دا بەکار هێناوە.

٣- ماڵەکەی لە چ سەرچاوەیەك پەیداکردووە و لە پێناوی چی دا سەرفی کردوە.

٤- وە لەو زانیارییەی ئەتزانی تا چەندێ کردەوەت پێ کردووە.

ئێستەش بە فەرموودەیەکی (ئیمامی عەلی) ﵁ و (حەسەنی بەسری) ﵁ کۆتایی پێ دێنین:

- (عەلی کوڕی ئەبوتالێب) ﵁ لە وەسفی دونیادا ئەفەرموێت: «دَارٌ مَنْ صَحَّ فِيْهَا أَمِنَ، وَمَنْ سَقَمَ فِيْهَا نَدَمَ، وَمَنْ افْتَقَرَ فِيْهَا حَزَنَ، وَمَنْ اِسْتَغْنَى فِيْهَا فَتَنَ، مِنْ حَلاَلُهَا حِسَابٌ وَمِنْ حَرَامُهَا الْنَّارٌ»[(١)].

واتە: دونیا خانوویەکە هەرکەس تێیدا گەنج بێت پیر دەبێت، وە هەرکەس نەخۆش بێت پەشیمانە تێیداو هەرکەس هەژار بێت تێیدا خەفەت بارە، وە هەرکەس دەوڵەمەند بێت تێیدا تووشی بەڵاو ناخۆشی دەبێت، وە لە حەڵاڵەکانی دونیادا لێپرسینەوە هەیە، وە لە حەرامەکانی دا سزای ئاگرە.

- وە (حەسەنی بەصری) ﵀ لە نامەیەك دا بۆ (عومەری کوڕی عبدالعزیز) ئەنوسێت: «فَإِنَّ الـدُّنْيَا دَارُ ظَعْنٍ لَيْسَتْ بِدَارِ إِقَامَةٍ،

---

(١) ابن أبي الدنيا في " ذم الدنيا " (١٨).

إِنَّمَا أُنْزِلَ إِلَيْهَا آدَمُ عُقُوبَةً»[١].

واتە: دونیا شوێنی کۆچکردنە نەك شوێنی داکوتان و مانەوە، وە پێغەمبەر (ئادەم) ﷺ لە سزای هەڵەکردنەکەیەوە نێردراوەتە دونیا.

کەواتە شوێنێك کە لەئەنجامی سزادا بخرێتە ناوی ئەبێت چ خۆشی و حەواندنەوەیەکی تێدا بێت! بەڵکو لە دونیادا بە شوێنی سزا دەوترێت بەندیخانە (سجن) بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ نمونەی دنیای بە بەندیخانە لێکداوەتەوە بۆ موسڵمانان[٢].

## بەڵگەی دەوڵەمەندەکان لەسەر پلەی دەوڵەمەندی لای خودا

دوای گوێگرتنێکی دوورو درێژو بێدەنگییەکی تەواو، دەوڵەمەندەکانیش هەڵسان بە وتاردان چەند ئایەت و فەرموودە و شیتەڵکردنەوەیەکیان پێشکەش کرد بەمجۆرەی خوارەوە دەستیان پێکرد:

یەکێکیان هەستا بەناوی دەوڵەمەندەکانەوە وتی: ئەی هەژارەکان باشترین بەڵگەو نمونەتان بۆ هێناینەوە ئێمەش ئەزانین ئەوەندەو

(١) حلية الأولياء (٢/ ١٣٤).

(٢) سبق تخريجه ص٩٤.

چەندەهای ترتان هەیە بەڵام درێژەتان، پێدا وە خۆتان هێنایە سەر ئەو لایەنەی کە بە تەواوی سەرکەوتن‌و خاوەنی پلـەی بەرزن و بەرامبەرەکەتان پلـەی بەدەست نەهێناوە، بەڵام ئێمەش هەموو بەڵگەو نموونەکانمان ئەهێنین لـەگەڵ نموونەو بەڵگەکانتان ئەیخەینە تەرازووی شەرع و ژیرییەوە تا بۆمان دەرکەوێت باش لـە باشتر، بەڵام با لـە نێوانمان دا دەربکەوێت و دەرچێت ئەو کەسەی کە شێوەی خۆی کردووە بە یەکێکی زۆر هەژارو کەم دەست هەرچییەك پەیدا ئەکات ئەیخاتە سەر یەك و رژدی (پیسکە) و بێ سوود بۆ خۆی و خزم و خەڵکی، وە بەرگی هەژاری پۆشیوە بۆ کۆکردنەوەی زیاتر ئەگەر خوا پێی ببەخشێت پێخۆشحاڵە، ئەگەر لێی بگرێتەوە نارەزایە، بێئاگا لـە خوداو دوای ئارەزووەکانی دونیای کەوتووە، یاخود هەژارێکی نارازی لـەسەر هەژارییەکەی بەردەوام نارەزایی دەردەبرێت بە زمان و شێوە، ئەگەر خوا شتێکی پێ ببەخشێت رەزامەندە وە ئەگەر لێی بگرێتەوە نارەزایە، وە بەهەموو کاتێك هەوڵ دەدات بۆ دونیا، بەڵام با سەیرێکی برا پێشووەکانمان (کاتی پێغەمبەرو یاوەرەکانی) بکەین کە هەموو ژیانیان پێشبرکێ بووە بۆ رەزامەندی خواو رۆژی کۆتایی هەر بە هەژارو دەوڵەمەندییەوە: ئەوانە برا برِوادارەکانمان کە خەڵکی دەربارەیان دەڵێن کامیان بەرێزترین پلـە، یان بەرزترە لـە کامیان،

هەژارانیان یا دەوڵەمەندیان؟! بەڵام ئەوان خۆیان سەیری ئەوەیان نەکردووە کامیان پلەیان بەرزترە لە کامیان بەڵکو سەیری ئەوەیان ئەکرد تا بزانن کامیان لە خوار کامیانەوەن لە پلەو سزای دوارۆژدا.

بەڵام لە قورئان دا لە چەندەها شوێن دا باسی کردەوەی باش دەکات، وە وەسفی خاوەنەکەی ئەکات، وە ئەو کردەوانەش بە پارەو ماڵ نەبێت نایەتە دی وەکو (زەکات، یارمەتی هەژاران، سەرفکردنی لە ڕێگەی چاکەدا، وە خۆبەختکردن لە پێناوی خوا بەماڵ، ئامادەکردنی پێداویستی شەڕ، بەندە ئازادکردن، خواردن بەخشینەوە لەکاتی گرانی دا)، ئارامی هەژار لەکوێیە ئەگەر دەوڵەمەند یارمەتیان نەدات و ڕزگاریان نەکات لە برسییەتی و تینوییەتی و بێ پۆشاکی و ماندوویی؟! ئارامی هەژار لەکوێیە بەرامبەر سوودی دەوڵەمەند کە هەوڵی سەرکەوتن ئەدات لە پێناوی خواداو دوژمن لەناو بردن و بەرزکردنەوەی ئاین و دامەزراندنی وڵات بۆ بەڕێوەبردنی فەرمان و یاساکانی پەروەردگار؟!

- ئارامیی (ئەبو زەر) لەکوێ لەسەر هەژاری و شوکرانەی (ئەبوبەکر) لەکوێ؟ کە چەندەها بەندەی ئەکڕی و ئازادی ئەکرد لە ژێر سزای بێباوەڕەکان دا! وە سەرفکردنی ماڵ لە پێناوی سەرکەوتنی ئیسلام دا! وەك پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: «مَا نَفَعَنِي مَالٌ مَا نَفَعَنِي

مَالُ أَبِي بَكْرٍ»[(١)].

**واتە: ماڵی هیچ کەس بەکەڵکم نەهات وەك ماڵی ئەبوبەکر.**

- **ئارامی هەژارانی (أهل الصفة) لەکوێ و ئەو هەموو سەرفکردنی ماڵە لە پێناوی ڕێکخستنی سەربازانی ئیسلام بۆ پاراستنی دەوڵەتی ئیسلام و بڵاوکردنەوەی ئاینی پیرۆز لەکوێ؟ وەك پێغەمبەر ﷺ دەربارەی (ئیمامی عوسمان) کە بە ماڵەکەی سوپایەکی زۆری ڕێکخست دەفەرموێت: «مَا ضَرَّ ابْنُ عَفَّانَ مَا عَمِلَ بَعْدَ الْيَوْمِ»[(٢)].**

**واتە: هەرچی بکات عوسمان لەمڕۆ بەدواوە زیان ناکات.**

**وە فەرموویەتی: خوا لێت خۆش بێت ئەی عوسمان ئەوەی بە ئاشکرا ئەیکەیت و وە ئەوەی بە نهێنی.**

- **ئەگەر سەیرێکی قورئان بکەین ئەبینین ئەوەندەی باس و وەسفی چاکەکاران دەکات ئەوەندە وەسفی هەژارو ئارامگر ناکات، وەك پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: «الـيَـدُ الـعُلْيَا خَـيْرٌ مِنَ الـيَدِ الـسُّفْلَى،**

---

(١) كتاب " فضائل الصحابة "لإمام أحمد (٢٥) باسناد صحيح، وابن ماجه (٩٤)، وأحمد في " المسند " (٧٤٣٩)، والنسائي في " الكبرى " (٥/ ٣٧)، وابن حبان (٦٨٥٨) وقال محققه (شعيب الأرنؤوط): إسناده صحيح على شرط البخاري.

(٢) " صحيح سنن الترمذي " للألباني (٢٩٢٠)، والحاكم (٣١٠٢) وصححه، وأحمد (٢٠٦٣٠).

فَاليَدُ العُلْيَا: هِيَ الْمُنْفِقَةُ، وَالسُّفْلَى: هِيَ السَّائِلَةُ»(١).

واتە: ئەو دەستەی لەسەرەوەیە باشترە لەو دەستەی لە خوارەوەیە.

دەستی سەرەوە دەستی خێروٚمەندەکەیە، وە خوا بە پێغەمبەر ﷺ دەفەرمویٚت: ﴿وَوَجَدَكَ عَآئِلًا فَأَغْنَىٰ﴾ [الضحى: ٨] هەژارو کەمدەست بوویت دەولّەمەندی کردیت، بێگومان خوا لە چۆنیەتییەکەوە پێغەمبەر نابات بۆ چۆنیەتییەکی تر ئەگەر باشتر نەبێت، واتە هەژاری بۆ دەولّەمەندی.

کەواتە دەولّەمەندی خێرە و باشترە، بەلاّم (عەمری کوڕی عاص) تەفسیری ئەم ئایەتە بەم شێوەیە ناکات و بەرپەرچی دەداتەوە و دەلّێت: (ئەو کاتە عەرەب بەگشتی بێ دەسەلاّت و هەژار بوون)، ئەمە تێبینییەکە کە تێکەلّی باسەکەمان کرد.

- وە دەولّەمەندی لەگەلّ سوپاس و ستایشی خوادا ڕێزو بەزەییە ﴿وَٱللَّهُ يَخْتَصُّ بِرَحْمَتِهِۦ مَن يَشَآءُ ۚ وَٱللَّهُ ذُو ٱلْفَضْلِ ٱلْعَظِيمِ﴾ [البقرة: ١٠٥]، وە هەر دەولّەمەندە ڕەزامەندەکان دەبنە هۆی ئەوەی کە هەژارە ئارامگرەکان خواپەرستی بکەن بە یارمەتیدان و چاکەکردن لەگەلّیاندا، وە یارمەتیدانیان بۆ خواپەرستی، وە بێگومان

(١) رواه البخاري (١٤٢٩)، ومسلم (١٠٣٣).

پاداشتی دەوڵەمەندەکانیشی تێدایە بەبێ ئەوەی لە پاداشتی ئەوان کەم بێتەوە وەك ڕۆژوو، شکاندنی ڕۆژووەوانێك ڕزگاربوونە لە دۆزەخ و لێخۆشبوونی هەیە لای خوا وە پاداشتی وەکو ڕۆژووەوانەکەیە.

- (عومەری کوڕی خەتاب) رضي الله عنه دەفەرمویت: خێرو خێرات پاراستنی ئادەمیزادە لە ئاگر.

- وە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: «وَالْصَّدَقَةُ تُطْفِئُ الْخَطِيْئَةَ كَمَا يُطْفِئُ الْمَاءُ الْنَّارَ»[(١)].

واتە: خێرو خێرات هەڵەو خراپە لادەبات وەك ئاو ئاگر دەکوژێنێتەوە.

- وە هەموو خێرو چاکەیەك بەڵا دەگێڕێتەوە، وە ئەگەر خوا خۆش بوویێت لە یەکێك لەبەر ئەوەی سەگێکی تینووی تێر ئاو کردبێت دەبێت پاداشتی ئەوانە چۆن بێت کە چەندەها ئادەمیزادیان لە برسیەتی و تینویەتی و بێ بەرگی ڕزگار کردووە؟!

- وە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: «اتَّقُوا الْنَّارَ وَلَوْ بِشِقِّ تَمْرَةٍ،

---

(١) صححه الألباني في " صحيح الترغيب والترهيب " (٢٨٦٦)، و" الصحيحة " (٨٤٦)، و" تراجعات الألباني " (١٣)، وصححه سليم الهلالي في " صحيح الأذكار " (١٠١٢، ٧٧٣).

فَمَنْ لَمْ يَجِدْ فَبِكَلِمَةٍ طَيِّبَةٍ»[(١)].

**واته:** خۆتان بپارێزن لە دۆزەخ ئەگەر بە لەتە خورمایەکیش بێت ئەگەر نەتان بوو بە وتەو قسەیەکی باش، ئەگەر نەیان بوو بە ماڵ ئەوە با بە قسە بێت.

کەواتە ماڵ لە پێشترە سەرەرای ئەوەی کە چەندەها جار خوا خۆشەویستی خۆی دەردەبڕێت بەرامبەر بە خێرکردن و یارمەتیدان وە هەر بەبۆنەی ماڵەوە برایەتی و دۆستایەتی پێك دێت.

- وە لە یارمەتیدانی خەڵکی دا سوودێکی زۆری تێدایە کە ناژمێردرێت وەك (ئیبراهیمی نەخەعی) رضي الله عنه دەڵێت: خێرو خێرات ستەم لەسەرت لادەبات، وە تاوان لادەبات، وە ماڵ دەپارێزێت، وە رۆزی زیاد دەکات، وە دڵت خۆش دەکات، وە دەبێتە شوێنی بڕواو گومانی باشی خەڵکی و دوورت دەخاتەوە لە خراپە، هەروەك پیسکەیی ئەبێتە هۆی شوێنی گومانی خراپی خەڵکی وە هەموو چاکەیەکت لەناو دەبات و دڵگران و بەرچاو تەنگ دەبیت[(٢)].
- بە چاکەکردن شەیتانت لێ دوور دەکەوێتەوە، دڵ و دەرونت پاك دەبێت و خۆشەویست ئەبیت لای خوا پاشان لای خەڵکی، وە

---

(١) رواه البخاري (٦٥٦٣)، ومسلم (١٠١٦).

(٢) عدة الصابرين ص٣٩٣.

دەبێتە هۆی شاردنەوەی هەموو ناتەواویەکت، وە تەمەنت زیاد دەکات و ئەبێتە نزای خێری خەڵکی بۆت لە ڕۆژی دوایی دا، وە داوای لێخۆشبوونت بۆ دەکات لای خوا إن شاء الله، وە دەبێتە هۆی لابردنی هەموو خراپەیەك لە دونیاو ڕۆژی دوایی دا، وە هانت دەدات بۆ کردنی چاکەی زیاتر، وە سەرەڕای ئەوەی هەر چاکەیەکی پێ بکەیت لە ڕۆژی دوایی دا بەو وێنەیە پاداشتت دەدرێتەوە.

- وە پێغەمبەر ﷺ لە چەندەها فەرموودەدا ئاگادارمان دەکاتەوە کە: «الْمُسْلِمُ أَخُو الْمُسْلِمِ لاَ يَظْلِمُهُ وَلاَ يُسْلِمُهُ، وَمَنْ كَانَ فِي حَاجَةِ أَخِيهِ كَانَ اللَّهُ فِي حَاجَتِهِ، وَمَنْ فَرَّجَ عَنْ مُسْلِمٍ كُرْبَةً، فَرَّجَ اللَّهُ عَنْهُ كُرْبَةً مِنْ كُرُبَاتِ يَوْمِ القِيَامَةِ، وَمَنْ سَتَرَ مُسْلِمًا سَتَرَهُ اللَّهُ يَوْمَ القِيَامَةِ»[(١)]، «مَنْ أَعْتَقَ رَقَبَةً مُسْلِمَةً، أَعْتَقَ اللَّهُ بِكُلِّ عُضْوٍ مِنْهُ عُضْوًا مِنَ النَّارِ، حَتَّى فَرْجَهُ بِفَرْجِهِ»[(٢)]، «مَنْ نَفَّسَ عَنْ مُؤْمِنٍ كُرْبَةً مِنْ كُرَبِ الدُّنْيَا، نَفَّسَ اللهُ عَنْهُ كُرْبَةً مِنْ كُرَبِ يَوْمِ الْقِيَامَةِ، وَمَنْ يَسَّرَ عَلَى مُعْسِرٍ، يَسَّرَ اللهُ عَلَيْهِ فِي الدُّنْيَا وَالْآخِرَةِ، وَمَنْ سَتَرَ مُسْلِمًا، سَتَرَهُ اللهُ فِي

---

(١) رواه البخاري (٢٤٤٢).

(٢) رواه البخاري (٦٧١٥).

الدُّنْيَا وَالْآخِرَةِ، وَاللهُ فِي عَوْنِ الْعَبْدِ مَا كَانَ الْعَبْدُ فِي عَوْنِ أَخِيهِ، وَمَنْ سَلَكَ طَرِيقًا يَلْتَمِسُ فِيهِ عِلْمًا، سَهَّلَ اللهُ لَهُ بِهِ طَرِيقًا إِلَى الْجَنَّةِ، وَمَا اجْتَمَعَ قَوْمٌ فِي بَيْتٍ مِنْ بُيُوتِ اللهِ، يَتْلُونَ كِتَابَ اللهِ، وَيَتَدَارَسُونَهُ بَيْنَهُمْ، إِلَّا نَزَلَتْ عَلَيْهِمِ السَّكِينَةُ، وَغَشِيَتْهُمُ الرَّحْمَةُ وَحَفَّتْهُمُ الْمَلَائِكَةُ، وَذَكَرَهُمُ اللهُ فِيمَنْ عِنْدَهُ، وَمَنْ بَطَّأَ بِهِ عَمَلُهُ، لَمْ يُسْرِعْ بِهِ نَسَبُهُ»[١].

واتە: هەرکەس پۆشاکێك بۆ موسوڵمانێك بکات خوا لە پۆشاکی ڕازاوەی بەهەشت ئەیپۆشێ، وە هەرکەسێك برسییەك تێر بکات خوا لە میوەی بەهەشت تێری دەکات، وە هەرکەسێك بەندەیەك ئازاد بکات خوا هەموو ئەندامەکانی لەشی ئەو کەسە ڕزگار دەکات لە دۆزەخ دەست بەدەست و قاچ بە قاچ، وە هەرکەسێك نارِەحەتییەك ئاسان بکات لەسەر موسوڵمانێك خوا لە نارِەحەتی دونیاو ڕۆژیی دوایی ڕزگاری دەکات، وە هەرکەسێك بەڵایەك لەسەر موسوڵمانێك لابدات خوا لە قیامەت ئەیپارێزێت، خوا لەگەڵ ئەو کەسەدایە کە بەردەوام لەگەڵ براکەیدایە بە یارمەتی. ئەمانە هەمووی فەرموودەو وتە جوانەکانی پێغەمبەرن ﷺ وە ئەمانە هیچی بەماڵ و سامان نەبێت نایەتە دی، لەگەڵ ئەوەش دا ئێمە دژایەتی ئارامی هەژاران ناکەین، بەڵام

(١) رواه مسلم (٢٦٩٩).

ئارامگرتن لەکوێ و ئەم پلە بەرزانە لەکوێ کە بە بۆنەی دەسەڵاتی دونیاوە دێتە دی؟!

• پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: «لَا حَسَدَ إِلَّا فِي اثْنَتَيْنِ: رَجُلٌ آتَاهُ اللهُ الْقُرْآنَ فَهُوَ يَقُومُ بِهِ آنَاءَ اللَّيْلِ، وَآنَاءَ النَّهَارِ، وَرَجُلٌ آتَاهُ اللهُ مَالًا، فَهُوَ يُنْفِقُهُ آنَاءَ اللَّيْلِ، وَآنَاءَ النَّهَارِ»(١).

**واتە:** چاوتێبڕین (حسود)ی لە دوو شت دا نییە، پیاوێك قورئانی لەبەر بێت بە شەوو ڕۆژ نوێژ بکات وە تێیدا بیخوێنێت، وە پیاوێك خوا سامان و ماڵی پێ ببەخشێت و شەوو ڕۆژ خەریکی بەخشینەوەی بێت لە پێناوی خوادا.

لێرەدا پێغەمبەر ﷺ دەوڵەمەندی و بەخشینەوەی لە پێناوی خوا خستوەتە ڕیزی قورئان و شەونوێژەوە، بێگومان هەروەك لە فەرموودەکەی پێشوودا کە باستان کرد کە دەوڵەمەند دەوڵەمەندییەکەی بە زانستەکەی بەکار ئەهێناو باشترین شوێنی بوو لای خوا، بەڵام هەژارەکە بە زانستەکەی خۆزگەی پێ دەخواست و نیەتی وابوو ئەگەر ئەویش دەوڵەمەند بوایە وەکو ئەو ئەبوو، لێرەدا هەردووکیان پاداشتیان وەك یەکە لەسەر کردەوەو نیەت، وە ئەوەش

---

(١) رواه البخاري (٥٠٢٥)، ومسلم (٨١٥)، وفي " صحيح سنن ابن ماجه " (٣٣٩٣).

بزانین دەوڵەمەندەکە کردەوەو نیەتەکەی هەیە، بەڵام هەژارەکە نیەتەکەی هەیە لەگەڵ وتنی دایە بە زمان ئیتر کردەوەی نییە، کەواتە بنەڕەتی پاداشت بۆ دەوڵەمەندەکەیە لەگەڵ ئەوەش دا پاداشتیش هەیە بۆ هەژارەکە لەسەر نیەتەکەی، بەڵام پاداشت لای خوا پلەی زۆری هەیە هەروەك یەکێك نیەتی هەبێت بچێت بۆ حەج وە بەتەواوی حەجەکە بکات لەگەڵ ئەوەش دا لەپێش دا نیەتی هەبووە، لێرەدا ئەوەی چووە بۆ حەجەکە بە نیەتەکەوە پاداشتی زیاترە لەوەی کە بەس نیەتەکەی هەیە و ماڵی نییە پێی بڕوات بۆ حەج کردن، پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: «مَنْ سَأَلَ اللهَ الشَّهَادَةَ بِصِدْقٍ، بَلَّغَهُ اللهُ مَنَازِلَ الشُّهَدَاءِ، وَإِنْ مَاتَ عَلَى فِرَاشِهِ»(١).

واتە: ئەو کەسەی بە دڵێکی تەواو ئاواتی ئەوە بێت بە پلەی شەهیدی بگات بە خوا پلەی شەهیدی پێ دەبەخشێت ئەگەر لەسەر جێگادا بێت.

واتە پلەیەك لە پلەکانی شەهیدی پێ دەبەخشێت کە سەد پلەیە ئیتر وەك پێغەمبەر هەواڵمان پێ ئەدات پاداشتی خێر لە یەکەوە تا دە و تا سەد، لە سەدەوە تا حەوت سەد زیاتریش بەگوێرەی

---

(١) رواه مسلم (١٩٠٩).

نیتەکەی[١].

- هەروەها کاتێك هەژارەکان گەڕانەوە بۆلای پێغەمبەر ﷺ وتیان: ئەو زیکرەی بە ئێمەت پێشاندا لەدوای نوێژەکەوە بیکەین پاداشتمان هەیە وەك پاداشتی کردەوەی دەوڵەمەندەکان، ئێستا دەوڵەمەندەکان ئەمەیان بیستووە ئەوانیش سەرەڕای کردەوەکانیان ئەم زیکرانە دەخوێنن، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: «ذَلِكَ فَضْلُ اللهِ يُؤْتِيهِ مَنْ يَشَاءُ» واتە ئەوە ڕێزو پلەیەکە خوا دەیبەخشێت بە هەرکەسێك ویستی هەبوو، بەلاّم لە گێڕانەوەیەکی تردا پێغەمبەر ﷺ دوای ئەوە پێیان دەفەرموێت: «يَدْخُلُ فُقَرَاءُ الْمُؤْمِنِينَ الْجَنَّةَ قَبْلَ الْأَغْنِيَاءِ بِنِصْفِ يَوْمٍ، خَمْسِمِائَةِ عَامٍ»[٢].

**واتە:** ئەی مژدەتان نەدەمیٚ کە هەژارە موسڵمانەکان لەپێش دەوڵەمەندە موسوڵمانەکانەوە دەچنە بەهەشتەوە بە پێنج سەد ساڵ[٣].

---

(١) هەروەك چۆن خوا دەفەرموێت: ﴿مَّثَلُ ٱلَّذِينَ يُنفِقُونَ أَمْوَٰلَهُمْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ كَمَثَلِ حَبَّةٍ أَنۢبَتَتْ سَبْعَ سَنَابِلَ فِي كُلِّ سُنۢبُلَةٍ مِّاْئَةُ حَبَّةٍۗ وَٱللَّهُ يُضَٰعِفُ لِمَن يَشَآءُۗ وَٱللَّهُ وَٰسِعٌ عَلِيمٌ﴾ [البقرة: ٢٦١].

(٢) سبق تخريجه ص ٧١.

(٣) وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَإِنَّ يَوْمًا عِنْدَ رَبِّكَ كَأَلْفِ سَنَةٍ مِمَّا تَعُدُّونَ﴾ [الحج: ٤٧].

کەواتە لێرەدا هەژارەکان لەجیاتی ئەو کردەوەی دەوڵەمەندانە خاڵێکی تریان هەیە ئەویش ئەوەیە لەپێش دەوڵەمەندەکانەوە دەچنە بەهەشتەوە بە سەلامەتی، بەڵام لەبەر نەبوونی دادگایی و لێپرسینەوەی قورس بەسەریانەوە نەك پلە بەرزی دەوڵەمەندی مایەی خێرە، بۆیە خوا بەخێر ناوی دەبات: ﴿كُتِبَ عَلَيۡكُمۡ إِذَا حَضَرَ أَحَدَكُمُ ٱلۡمَوۡتُ إِن تَرَكَ خَيۡرًا ٱلۡوَصِيَّةُ﴾ [البقرة : ١٨٠] ئەگەر یەکێك لە سەرەمەرگ دا پارەو ماڵ و خێرێکی بەجێ هێشت بۆ ئەوانەی دوای خۆی. وە دەفەرموێت: ﴿وَإِنَّهُۥ لِحُبِّ ٱلۡخَيۡرِ لَشَدِيدٌ﴾ [العاديات : ٨] وە ئەگەر پارەو ماڵ هۆیەکی سەرەکی نەبێت بۆ هەڵسوراندنی ژیان خوا فەرمانی نەدەدا کە بیپارێزێت لە دەستی مندڵ و شێت و تێکچوو، وەك پێغەمبەر ﷺ بە (عەمر)ی فەرموو: «يَا عَمْرُو ، نِعْمَ الْمَالُ الصَّالِحُ لِلْمَرْءِ الصَّالِحِ»[١].

**واتە:** ماڵی باش بۆ پیاوی باش.

وە (سەعیدی کوڕی موسەییب) رضي الله عنه دەڵێت: «لَا خَيْرَ فِيمَنْ لَا يُرِيدُ جَمْعَ الْمَالِ مِنْ حِلِّهِ، يَكُفُّ بِهِ وَجْهَهُ عَنِ النَّاسِ، وَيَصِلُ بِهِ رَحِمَهُ،

---

(١) رواه أحمد (١٨٤٠١)، وابن حبان (٣٢١٠)، وفي " غاية المرام " (٤٥٤)، و" الأدب المفرد " (٢٩٩)، والبيهقي في " الشعب " (١١٩٠).

وَيُعْطِي مِنْهُ حَقَّهُ»[١].

واتە: ئەو کەسە خێری تێدا نییە کە نایەوێت پارەو ماڵ کۆبکاتەوە تا یارمەتی خزم و کەس وکارو خەڵکی پێ بدات، وە مافی خوای لێ بدات.

وە خوای گەورە خێرو بەخشندەیی خستۆتە پێش کارە چاکەکانی ترەوە: ﴿إِنَّ ٱلۡمُصَّدِّقِينَ وَٱلۡمُصَّدِّقَٰتِ وَأَقۡرَضُواْ ٱللَّهَ قَرۡضًا حَسَنًا﴾ [الحديد: ١٨].

(سوفیانی سەوری) ﵁ دەفەرموێت: «الْمَالُ فِي هَذَا الزَّمَانِ سِلَاحُ الْمُؤْمِنِ»[٢].

واتە: سامان و ماڵ لە ئەمڕۆی ئێمەدا چەکی موسڵمانە.

واتە وەکو چەك بەکاردەهێنرێت بۆ خۆپاراستن، ئەمانە هەمووی بەڵگەن لەسەر باشی دەوڵەمەندی، بەڵام نەك دەوڵەمەندییەك نەزانێت چۆن سەرفی بکات وە ئەیدات بە خاوەنی ڕاستی خۆی، وە هەردەم دڵی بە دەوڵەمەندییەکەیەوە بەستراو بێت تا لێی کەم نەبێتەوە، بێئاگای

---

(١) ابن الفرج الجوزي في " تلبس إبليس " ص١٨١، وأبو نعيم في الحلية (٢/ ١٧٣)، وابن أبي الدنيا في " إصلاح المال " (٥٥).

(٢) ابن الفرج الجوزي في " تلبس إبليس " ص١٨١، وأبو نعيم في الحلية (٦/ ٣٨١).

کردووە لە خواو ڕۆژی دوایی، وە هەر سەرفی بکات لە پێناوی نەفس و ئارەزووەکانی دونیادا.

هەروەك پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: «تَعِسَ عَبْدُ الدِّينَارِ، وَالدِّرْهَمِ»[١].

واتە: لەناوچێت بەندەی دینارو درهەم ئەگەر زیاد بوو پێی خۆشەو ئەگەر کەمی کرد نارەزایە.

هەر بە بۆنەی ماڵەوە دەتوانیت خواپەرستی بکەیت و حەج و خۆبەختکردن و مزگەوت کردنەوەو بەندە ئازادکردن، وە هەر بە ماڵ ئەتوانیت ژنی پێ بهێنیت کە یارمەتیت ئەدات بۆ ئەوەی ئیمانت پێی دابمەزرێت وە باشترە لە نوێژی سوننەت، وە هەر بە بۆنەی دەوڵەمەندییەوە سیفەتی بەخشندەیی و سەربەرزی ئەبێت، وە ئەبێتە هۆی دۆستایەتی و خۆشەویستی، وە هۆی گەیشتن بە پلەی بەرزی ڕەزامەندی خوا.

هەروەك هەندێ لە سەلەف فەرموویانە: (پلە بەرز لای خوا بەدەست ناهێنیت ئەگەر بەکردەوە نەبێت، وە کردەوەش بەس بە ماڵ دەکرێت)[١]. وە هەندێکیان فەرموویانە: (ئەی خوایە من لەو بەندانەتم

---

(١) رواه البخاري (٢٨٨٦)، صحيح سنن ابن ماجه (٣٣٣٦).

کە بەس دەوڵەمەندی بەکەڵکم دێت)[٢] . هەروەك (قەیسی کوڕی سەعد) ئەم داواکارییەی وتووە. بەڵام هەندێکیش وەکو (ئەبو زەرو هاوڕێکانی) کەمدەستی و هەژارییان هەڵبژاردووە بۆخۆیان.

وە هەر بەو ماڵە ئەچێتە بەرزترین پلەی بەهەشتەوە، وە هەر بەو ماڵەش ئەکەوێتە ناوەڕاستی دۆزەخەوە وەکو ئەو سیانەی کە خوا تاقیکردنەوە (کوێرەکەو گولەکەو کەچەڵەکە)[٣] لە ئەنجامدا تەنها کوێرەکە دەرچوو لەبەر ئەوەی سوپاسی خوای کرد، وە ئەیزانی ئەمە خوا پێی بەخشیوە.

خۆبەختکردن (جهاد) بەرهەمی هەرە لوتکەی کردەوەیە، خۆبەختکردن (جهاد) بە ماڵ و سامان دەکرێت لەگەڵ دەروون دا، وە هەندێ جاریش ماڵ باشترە لە دەروون (نفس). هەروەك (ئیمامی عوسمان) ﵁ پلەو پایەی بەرزترە تا (ئیمامی عەلی) ﵁ کە زووتر موسڵمان بووە، وە بەردەوامیش بەشداری جیهادی کردووە، لەبەرئەوەی (ئیمامی عوسمان) ﵁ بە پارەو ماڵ سەدەها خۆبەختکەری (مجاهد)ی ڕێکدەخست بەڵکو سوپایەکی ئەڕازاندەوە بەهەموو پێداویستییەکانی شەڕەوە.

---

(١) ، (٢) عدة الصابرين ص٤٠٠.

(٣) رواه البخاري (٣٤٦٤)، ومسلم (٢٩٦٤).

• (زوبێری کوڕی عەوام) و (عبدالرحمن ی کوڕی عەوف) زۆر بەرێزتر بوون لە زۆری هاوەڵەکان (أصحاب) و هەژارەکانی مەککە (أهل الصفة) کە لە سوچێکی مزگەوتەکەدا بوون، لەبەر ئەوە (زوبێر و عبدالرحمن) دەوڵەمەند بوون و لەپێناوی خواداو بەرزکردنەوەی ئایین دا سەرفیان ئەکردو هەوڵیان دەدا.

• هەروەك پێغەمبەر ﷺ بە (سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص)ی فەرموو: « ...أَنْ تَذَرَ وَرَثَتَكَ أَغْنِيَاءَ، خَيْرٌ مِنْ أَنْ تَذَرَهُمْ عَالَةً يَتَكَفَّفُونَ النَّاسَ ...»[1].

واتە: ئەگەر خێزانەکەت بە دەوڵەمەندی بەجێ بهێڵیت باشترە لەوەی بە هەژاری بەجێیان بهێڵیت، وە دەست لە خەڵکی پان بکەنەوە.

• وە جارێك باسی پیاوێکیان بۆ پێغەمبەر ﷺ گێڕایەوە کە بەڕۆژوو بوو، وە بە شەویش شەونوێژ دەکات هەر خەریکی خواپەرستییە، فەرمووی: (کێ خزمەت و خواردنی ئەدات؟ وتیان: براکەی، فەرمووی: براکەی باشترە لەو). واتە خێر و چاکەی زیاترە لە براکەی تری. وە (سەعیدی کوڕی موسەییب) دەفەرموێت: (هیچ

---

(١) رواه البخاري (٢٧٤٢)، ومسلم (١٦٢٨).

باشه و چاکەیەك نییه لەو کەسەدا که حەز له ماڵ ناکات تاوەکو یارمەتی خزمەکانی بدات و پێ سپاردەکانی پێ بداتەوە وە پێویستی به یارمەتی بەندەکانی خوا نەمێنێت)[1].

وە پێغەمبەر ﷺ له زۆر پاڕانەوەدا داوای له خوا کردووە له هەژاری بیپارێزێت وەك دەفەرموێت: «اَللّهُمَّ إِنِي أَعُوذُ بِكَ مِنَ الْكُفْرِ وَالْفَقْرِ»[2].

واته: خوایه بمپارێزیت له بێباوەڕی و هەژاری.

وە هەر هەژارییه ئەبێته هۆی بێباوەڕی.

وە لەگەڵ ئەوەش دا دژایەتی ئەوە ناکەین که پێغەمبەر ﷺ هەژار بووەو خوا دەوڵەمەندی کردووە، وە دەرگای بەزەیی بۆ کردوەتەوە، هەروەك خواردنی ساڵێکی ئەدا به خێزانەکانی وە بەشی هەبووە لەو شتانەی که له شەڕدا گیراوە وەك دەفەرموێت: ﴿مَّآ أَفَآءَ ٱللَّهُ عَلَىٰ رَسُولِهِۦ مِنۡ أَهۡلِ ٱلۡقُرَىٰ فَلِلَّهِ وَلِلرَّسُولِ﴾ [الحشر: ٧].

وە پێغەمبەر ﷺ له خوای خۆی پاڕایەوە که: « ... أَنْ لَا يُهْلِكَهَا بِسَنَةٍ عَامَّةٍ ...»[3].

---

(١) ابن أبي الدنيا في " إصلاح المال " ص٥٥، وأبو نعيم في " الحلية " (٢/ ١٧٣).

(٢) صحيح سنن أبي داود (٥٠٩٠).

(٣) رواه مسلم (٥١٢٢).

واتە: موسوڵمانان بە گرانی لەناو نەچن.

ئەگەر دەوڵەمەندی سوپاسگوزار بەڵگە بێنێتەوە لەسەر ژیان و حاڵی پێغەمبەر ﷺ لێی تێناگات و نایەتە دی هەتا ئەو کردەوانە نەکات کە پێغەمبەر ﷺ کردوویەتی، وە ئەگەر هەژاری ئارامگریش بەڵگە بێنێتەوە لەسەر ژیان و حاڵی پێغەمبەر ﷺ لێی تێناگات و نایەتە دی تا ئەو کردەوانە نەکات کە پێغەمبەری خوا کردوویەتی.

هاوڕێیانی بەڕێز: هەژارانی ئارامگر باسی دوورکەوتنەوە (زهد) تان کرد لە دونیا بەڵام (زوهد)و دوورکەوتنەوەی دەوڵەمەند لە خراپە پلەی بەرزترە لەبەر ئەوەی لەبەردەستیایەتی و دەسەڵاتی هەیە بەسەریا و نایکات، بەڵام هەژار نیەتی و دەسەڵاتی بەسەردا نییە، گرنگی بە لایەنی دونیاش نادات لەبەرئەوە کە نیەتی.

- پرسیاریان کرد لە (ئیمامی ئەحمەد) رحمه الله: ئەگەر یەکێك هەزار دیناری هەبێت ئایا زوهدی تێدایە؟ وتی: بەڵێ بەمەرجێك ئەگەر زیاد بوو پێی خۆش نەبێت وە کەم بوو پێی ناخۆش نەبێت[١].

- وە زانای بەرز (ابن تیمیة) رحمه الله دەفەرموێت: زوهد ئەوەیە دووربکەویتەوە لەوەی کە بەکەڵکت نایەت، وە وەرعیش ئەوەیە دووربکەوێتەوە لەوەی زیانت پێ دەگەیەنێت[٢].

---

(١) عدة الصابرين ص٤٠٥.

(٢) عدة الصابرين ص٤٠٥.

- وەهەندێك دەفەرموون: خاوەنی زوهد ئەو کەسەیە کە زۆربوونی حەڵاڵ نەبێتە هۆی بێئاگایی لە سوپاسگوزاری وە یان ڕووتێکردنی زۆری حەرام نەبێتە هۆی نەمانی ئارامیان.

کەواتە بڕواداری بەهێزو توانا خۆشەویست و چاکترە لای پەروەردگار، وە ئیتر بزانین چ لایەك بەتوانا و کارمەندترە لە کارەکانیان دا، خوای گەورە یارمەتی هەموو لایەك بدات بۆ کاری خێرو چاکەو وەرگیراو.

## هەڵسەنگاندنی باسەکە

لە دوای باسی بابەتەکە بەشێوەیەکی دوورو درێژ لە هەردوولادا لە نێوان هەژارەکان و دەوڵەمەندەکان دا یاخود ئارامگرتن و سوپاسگوزاری پێویستی بەوە هەیە کە خوێنەر بۆی یەکلا بێتەوە کام لایەن پلەی بەزترە یاخود باشترە لەوی تریان؟

ئیمامی (ابن القيم) ﵀ هەڵدەستێت بە گونجاندن و هەڵسەنگاندنی بابەتەکە وەکو ئەنجامێکی زانیاری بۆ یەکلا کردنەوەی باسەکە لەگەڵ ڕەچاوکردنی پلەو کاری هەردوولادا وە دەفەرموێت:

نهێنی بابەتەکە ئەوەیە کە: ڕێگەی هەژاری و نەداری ڕێگەیەکی سەلامەت و دوور لە هەموو ئاڵۆزییەکە، وە ڕێگەی دەوڵەمەندی

بوون ڕێگەیەكی پڕ ئاڵۆزی و لێپرسینەوەیە، وە ئەگەر بێتو مافی خوای تێدا بدات و یارمەتی نەداران و لێقەوماوان بدات ئەوا ڕێگەكەی ڕزگاربوون و بەدەستهێنانی هەموو خێرێكە كە ئەم ڕێگەیە لەسەروو ڕێگەی سەلامەتی هەژارەكانەوەیە، بەڵام ڕێگەكە پڕە لە ترسناكی وە ئاگالێبوونێكی وردی دەوێت بۆ كۆكردنەوەی سامان و سەرفكردنی، كەواتە هەژارەكە وەكو نەخۆشێك وایە كە نەخۆشییەكەی نایەڵێت تووشی تاوان ببێت، وە دەوڵەمەندەكە وەكو موجاهیدێك و مامۆستایەكی خێر لەناو خەڵكی دا وایە پێویستی بە زۆر وردەكاریی و بەئاگابوون هەیە.

وە پرسیاریش بكرێت كامیان پلە بەرزترە و باشترە، ئەمە وەكو پرسیاركردنە لە خواردن و خواردنەوە كە بەبێ یەك نابن، كەواتە بەجێهێنانی فەرمانەكانی خوا نایەتەدی بە (صبر و شكر) نەبێت، وە هەروەها خۆپاراستن لە قەدەغەكراوەكانی خوا نایەتە دی بەبێ (صبر و شكر) ئارامگرتن و سوپاسكردنی خوا نەبێت، وە هەر بەڵایەك بەسەر هەر كەسێك دا بێت ئارامی لەسەر گرت مانای سوپاسی خوای لەسەر كردووە، واتە ئەنجامی ئارامییەكەی شوكرە، كەواتە هەرسێ بەشەكەی (صبر) كە ئەم سیانەی پێشوو بوو (أمر و نهي و مصائب)، (صبر و شكر) ئارامی و سوپاسكردن تێكەڵیانە وە پەیوەست و نەپچڕاون

بەیەکەوە، دەرکەوت دوو بابەتەکە زۆر لەیەکەوە نزیکن جیاوازیان ئەوەندە نییە بەڵکو تەواوکەری یەکن، بەڵام پرسیارێکی تر دێتە پێشەوە: ئایا ئەگەر هەردووکیان لەڕێك و هاو وێنەی یەکتری دا بوون کامیان باشترە؟ واتە دەوڵەمەند کە کەسێکی باوەڕدار بوو خواناس بوو لە کردەوەکانی دا و هەژارەکەش بەهەمان شێوە کەسێکی باوەڕدار و خواناس بوو لە کردەوە و ژیان دا ئایا کامیان پلەو پایەیان بەرزترە؟

**وەڵام:** ئەو کەسەیانە کە زۆر گرنگی دەدات بە فەرمان و سونەتەکانی واجب و مندوب تیایدا، واتە زیاتر فەرمانەکانی خواو سوننەتەکانی پێغەمبەری ﷺ تێدا ڕەچاو دەکات، وەك خوا دەفەرموێت: ﴿إِنَّ أَكۡرَمَكُمۡ عِندَ ٱللَّهِ أَتۡقَىٰكُمۡ﴾ [الحجرات : ١٣]، وە پلە بەرزییەتی لای خوای گەورە ئەگەڕێتەوە بۆ بەڕیوەبردنی کارەکە بە (واجب و مندوب)ەکان وەکو پێغەمبەر ﷺ لە فەرموودەیەکی قودسی دا دەفەرموێت: «وَمَا تَقَرَّبَ إِلَيَّ عَبْدِي بِشَيْءٍ أَحَبَّ إِلَيَّ مِمَّا افْتَرَضْتُ عَلَيْهِ، وَمَا يَزَالُ عَبْدِي يَتَقَرَّبُ إِلَيَّ بِالنَّوَافِلِ حَتَّى أُحِبَّهُ»[١].

واتە: بەندەیەك لە من نزیك نابێتەوە بە وێنەی ئەوانەی کە فەرمان و واجبم کردووە لەسەری، وە بەردەوام لە من نزیك دەبێتەوە بە

(١) رواه البخاري (٦٥٠٢).

کردنی سوننەتەکان هەتا خۆشم دەوێت.

کەواتە هەر کامێکیان زیاتر ورد تر فەرمان و سوونەتەکانی بەڕێوە برد ئەوەیان بە (تقوی) و خواناسترەو پلەی بەرزترە لەوی تریان: ﴿إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِندَ اللَّهِ أَتْقَاكُمْ﴾، وە ئەگەر هەردووکیان بە (تقوی) بوون ئەوا هەردووکیان باش و پلە بەرزن، وە بەڵگەیەکی بەهێزترمان بۆ ئەم بابەتە ژیانی دوو پێغەمبەری خوان کە یەکەمیان (سولەیمان) عليه السلام کە پاشاو دەسەڵاتدارو بەهێز بوو تەنانەت باڵندەو جیهانی (جن)ی بۆ تەرخانکرابوو لەژێر دەسەڵاتی دا سەرەڕای ئەم هەموو بوون و دەسەڵاتە پێغەمبەرێك و خواناسێکی پەروەردگار بوو، خوای گەورە وەسفی دەکات دەفەرمویت: ﴿وَوَهَبْنَا لِدَاوُودَ سُلَيْمَانَ نِعْمَ الْعَبْدُ إِنَّهُ أَوَّابٌ﴾ [ص : ٣٠]. واتە (سولەیمان) باشترین بەندە بوو لەبەرئەوەی باشترین خواناسی و گوێڕایەڵی و پشت بەستن بەخوای خۆی تێدا بوو، وە ئەیفەرموو: ﴿قَالَ هَٰذَا مِن فَضْلِ رَبِّي لِيَبْلُوَنِي أَأَشْكُرُ أَمْ أَكْفُرُ﴾ [النمل : ٤٠] دانی بەوەدا نا کە هەمووی نیعمەتی خوایەو بۆ تاقیکردنەوەیەتی، ئەگەر هەر دەوڵەمەندێك خواناس بێت بە باشی ئەوا وەکو (سولەیمان)ە عليه السلام.

وە پێغەمبەری دووەممان (أیوب)ە ﷺ کە خاوەنی هەژدە ساڵ بەڵاو ناخۆشییەکانی ژیان بوو ئارام گرێکی بەناوبانگ بوو، وە خوای گەورە وەسفی ئارامە پڕ خواناسییەکەی دەکات بەهەمان شێوازی وەسفی (سولەیمان) ﷺ وە دەفەرموێت: ﴿إِنَّا وَجَدْنَٰهُ صَابِرًا ۚ نِّعْمَ ٱلْعَبْدُ ۖ إِنَّهُۥٓ أَوَّابٌ﴾ [ص : ٤٤].

(أیوب) ﷺ نموونەی هەژارە خاوەن بەڵاو ناخۆشیەکانی ژیانە، لێرە بۆمان دەردەکەوێت کە (صبر و شکر) هەردووکیان لای خوای گەورە پلەو پایە بەرزن، وە کامیان زیاتر ڕۆچوو بێت لە خواناسی دا ئەوەیان لای خوای گەورە باشترین بەندەو خواناسە، وە ئەگەر هەردووکیانی هەبێت ئەوا هەردووکیان وەك بینیمان خوای گەورە بەیەك شێواز باس و وەسفی (سولەیمان و ئەیوب)مان بۆ دەکات کە باشترین خواناس بوون (نعم العبد إنه أواب) بۆ هەردووکیان ئەم شێوە بەکاردەهێنێت، کەواتە (صبر و شکر) هۆکارێکن بۆ تاقیکردنەوەی ئادەمیزادو بەدەست هێنانی پلەی بەرز لای خوای گەورە، وە هەریەکەیان ڕێگەیەکن بۆ کۆمەڵە کەسێك وەکو هەموو جۆرەکانی پەرستن (عبادة) وەك (سولەیمان) ﷺ فەرمووی: (لیبلوني ءأشكر) خوای گەورە تاقیم دەکاتەوە تاکو سوپاسی خوا ئەکەم یان نا؟

وە خوای گەورە هەردووکیانی بە تاقیکردنەوە باسکردووە: ﴿فَأَمَّا ٱلۡإِنسَٰنُ إِذَا مَا ٱبۡتَلَىٰهُ رَبُّهُۥ فَأَكۡرَمَهُۥ وَنَعَّمَهُۥ فَيَقُولُ رَبِّيٓ أَكۡرَمَنِ ١٥ وَأَمَّآ إِذَا مَا ٱبۡتَلَىٰهُ فَقَدَرَ عَلَيۡهِ رِزۡقَهُۥ فَيَقُولُ رَبِّيٓ أَهَٰنَنِ﴾ [الفجر: ١٥-١٦]، وە دەفەرمویێت: ﴿إِنَّا جَعَلۡنَا مَا عَلَى ٱلۡأَرۡضِ زِينَةٗ لَّهَا لِنَبۡلُوَهُمۡ أَيُّهُمۡ أَحۡسَنُ عَمَلٗا﴾ [الكهف: ٧].

وە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: «عَجَبًا لِأَمْرِ الْمُؤْمِنِ، إِنَّ أَمْرَهُ كُلَّهُ خَيْرٌ...»[(١)].

واتە: سەرسامم لە کاری موسوڵمان هەموو کارێکی بۆ ئەو خێرە، ئەگەر نیعمەتی بەسەردا بڕژێت سوپاسی خوای لەسەر دەکات بەخێر بۆی دەنوسرێت، وە ئەگەر ناخۆشی بەسەردا بێت ئارام دەگرێت و هەر بۆ ئەو خێرە.

وەك (سوفیانی سەوری) رضي الله عنه دەفەرموێت: کەسێك شارەزا نییە لە دین کە بەڵا بە نیعمەت و بە بەخشندە نەزانێت، وە خۆشی ژیان و نیعمەت بە موصیبەت و بەڵا نەزانێت[(٢)].

---

(١) رواه مسلم (٢٩٩٩).

(٢) ابن أبي الدنيا في " الشكر " ص٨١، وأبو نعيم في " الحلية " (٧/ ٥٥).

کەواتە هەردووکیان مایەی پاداشتن لەبەرئەوە ئەبینین لە هەردوو جۆرەکە لە ژیانی پێغەمبەردا ﷺ هەبوو، وەك سەردەمی مەککە لە ناخۆشی دا، وە سەردەمی مەدینە لە خۆشی دا. لە هەردوو جۆرەکەدا تەواو ڕەزامەندی و خوا ویستی تێدا بەڕێوە بردووە، وە لە یارەکانیشی دا هەردوو جۆرەکەی تێدا بووە وەکو (ئەبو زەرو هاوڕێکانی وەك بیلال و ئەبو هورەیرەو سەلمان)و.. هتد رضي الله عنهم لە هەژاری دا، وە وەکو (ئەبوبەکر و عبدالرحمن ی کوڕی عەوف و عوسمانی کوڕی عەفان و زوبێری کوڕی عەوام) لە دەوڵەمەندی دا.

لەگەڵ ئەوەش دا خوای گەورە دەربارەیان دەفەرموێت: ﴿رَّضِيَ ٱللَّهُ عَنۡهُمۡ وَرَضُواْ عَنۡهُ﴾ [البينة : ٨]. خوا لێیان ڕازییە لەبەر خواپەرستی و خواناسییەکەیان هەریەکەیان لە بواری خۆی دا.

وە سەرەڕای ئەمانەش خوای گەورە خۆی بە بەزەیی و زانایە بەسەر بەندەکانی دا کە هەریەکەیان چی بەکەڵکی دێت لە هەژاری و دەوڵەمەندی لە دونیادا، وە هەر ئەو (خبير، عليم، حكيم) زانا و دانا و کار بەجێیە و بە ئاگایە بەسەر بەندەکانی دا.

وە ئەمەش لە لایەکی ترەوە بەڵگەیە کە ئیسلام هیچ لایەنێکی بەر نەداوە لە ژیان و دونیادا و گرنگی داوە بە هەموو لایەك کە بەرژەوەندی ئادەمیزادی تێدا بێت، خوای گەورە یارمەتی هەموو لایەك

بدات بۆ کاری پەسەندو وەرگیراو و بێبەشمان نەکات لە پاداشتی ڕۆژ دوایی، وە یارمەتی هەژاران و دەوڵەمەندان بدات لەسەر ئەو تاقیکردنەوەیەی لە ڕێیان دایە.

اللَّهُمَّ اجْعَلْ عَمَلي صَواباً واجعَلهُ خَالِصاً وَلا تجعلهُ لأَحدٍ فيهِ شَيئاً
سبحانك اللهم وبحمدك أشهد أن لا إله إلا أنت أستغفرك وأتوب إليك

# وتە بەنرخەکان

١- قال بعض الصحابة ﷺ: «كُنَّا نَدَعُ سَبْعِينَ بَابًا مِنَ الْحَلَالِ مَخَافَةَ أَنْ نَقَعَ فِي بَابٍ مِنَ الْحَرَامِ»[(١)].

**واتە:** ئێمە وازمان لە حەفتا ڕێی حەڵاڵ دەهێنا لە ترسی ئەوەی نەکەوینە بەشێکی حەرامەوە.

٢- قال الفضيل رحمه الله: «تَرْكُ الْعَمَلِ مِنْ أَجْلِ النَّاسِ: رِيَاءٌ. وَالْعَمَلُ مِنْ أَجْلِ النَّاسِ: شِرْكٌ. وَالْإِخْلَاصُ: أَنْ يُعَافِيَكَ اللهُ مِنْهُمَا»[(٢)].

**واتە:** وازهێنان لە ئەنجامدانی کارو کردەوەی چاك لەبەر خەڵکی ڕیایە و کردنیشی لە پێناو خەڵك دا هاوبەش دانانە، نیەت پاکی ئەوەیە لە هەردووکیان سەلامەت بیت.

٣- قال الحسن البصري رحمه الله: «الْمُؤْمِنُ يَعْمَلُ بِالطَّاعَاتِ وَهُوَ مُشْفِقٌ وَجِلٌ خَائِفٌ، وَالْفَاجِرُ يَعْمَلُ بِالْمَعَاصِي وَهُوَ آمِنٌ»[(٣)].

---

(١) مدارج السالكين (٢/ ٢٥).

(٢) مدارج السالكين (٢/ ٩٢).

(٣) تفسير إبن كثير (٢/ ٨٥).

واتە: ئیماندار کاری چاك و خواپەرستی دەكات و بەردەوام لە ترسی وەرنەگرتنی دایە، بەڵام تاوانبار کاری چاك و خواپەرستی ناكات و نەترسە لە پەروەردگاری.

٤- قال ابن القيم رَحِمَهُ ٱللَّهُ: « الْإِخْلَاصُ عَدَمُ انْقِسَامِ الْمَطْلُوبِ. وَالصِّدْقُ عَدَمُ انْقِسَامِ الطَّلَبِ »[١].

واتە: نیەت پاکی دابەش نەبوونی مەبەستەکەتە، (واتە بەس بۆ خوا بێت) و ڕاستگۆیی دابەش نەبوونی داواکاریەکانە (واتە بەس داواکاریەکانی خوا جێبەجێ بکرێت).

٥- قال الجنيد رَحِمَهُ ٱللَّهُ: «الصَّادِقُ يَتَقَلَّبُ فِي الْيَوْمِ أَرْبَعِينَ مَرَّةً. وَالْمُرَائِي يَثْبُتُ عَلَى حَالَةٍ وَاحِدَةٍ أَرْبَعِينَ سَنَةً»[٢].

واتە: نیەت پاك و ڕاست ڕۆژی چل جار ئەملاولا ئەكات بۆ پاراستنی نیەتەکەی، ڕیابازیش لەسەر یەك شێوەیە چل ساڵ.

٦- قال عبدالقادر الجيلاني رَحِمَهُ ٱللَّهُ: «كُنْ مَعَ الْحَقِّ بِلَا خَلْقٍ. وَمَعَ الْخَلْقِ بِلَا نَفْسٍ»[٣].

---

(١) مدارج السالكين (٢/ ٩٢).

(٢) مدارج السالكين (٢/ ٨٥).

(٣) مدارج السالكين (٢/ ٣٢٦).

واتە: لەگەڵ خوا بە بەبێ خەڵکی (واتە هاوەڵ بۆ خوا قەرار مەدە)، وە لەگەڵ خەڵك بە بەبێ نەفس (واتە داواکاری و ویستی).

٧- قال ابن مسعود ﷺ: «أَنْتُمْ فِي زَمَانٍ يَقُودُ الْحَقُّ الْهَوَى، وَسَيَأْتِي زَمَانٌ يَقُودُ الْهَوَى الْحَقَّ»[(١)].

واتە: ئێوە (واتە صەحابە) لە کاتێك دان حەق ویست و ئارەزووەکانتان پێش خۆی دەدات (واتە لادانتان تێدا نییە)، کاتێك دێت هەواو ئارەزوو حەقەکان پێش خۆی دەدات.

٨- قال ابن عباس ﷺ: «أَوَّلُ مَا ضُرِبَ الدِّرْهَمُ أَخَذَهُ إِبْلِيسُ فَقَبَّلَهُ وَوَضَعَهُ عَلَى عَيْنِهِ وَسُرَّتِهِ وَقَالَ بِكَ أَطْغَى وَبِكَ أَكْفُرُ»[(٢)].

واتە: یەکەمجار پارە کە سکە کرا ئیبلیس وەری گرت و ماچی کردو خستیە سەر چاوی و وتی: بە تۆ خەڵك گومڕا دەکەم و بێبڕوایان دەکەم.

٩- قال بعض السلف: «لَا يَشَمُّ رَائِحَةَ الصِّدْقِ عَبْدٌ دَاهَنَ نَفْسَهُ أَوْ غَيْرَهُ»[(٣)].

---

(١) تفسير القرطبي (١٦/ ١٦٧).

(٢) تلبيس إبليس ص٣٤٩.

(٣) مدارج السالكين (٢/ ٢٨٥).

واتە: بۆنی حەق ناکات کەسێك هەوڵی ڕازیبوونی خۆیی و خەڵکی بێت.

١٠-قال أَبُو سَعِيدٍ الْخَرَّازُ: «التَّوَكُّلُ اضْطِرَابٌ بِلَا سُكُونٍ، وَسُكُونٌ بِلَا اضْطِرَابٍ»[١].

واتە: پشت بەستنی تەواو بە خوا بەکارهێنانی هۆکارەکانە بەبێ پشت بەستنی دڵی پێی، وە پشت بەستنی دڵی بە خوا بەبێ ئاوڕدانەوە بەلای هۆکارەکانەوە.

١١-قال بعض السلف: «مَا أَمَرَ اللهُ بِأَمْرٍ إِلَّا وَلِلشَّيْطَانِ فِيهِ نَزَعَتَانِ، إِمَّا إِلَى تَفْرِيطٍ، وَإِمَّا إِلَى مُجَاوَزَةٍ، وَهِيَ الْإِفْرَاطُ»[٢].

واتە: هیچ فەرمانێکی خوایی نییە ئیللا شەیتان تیای دا ویستی بە زیادەڕەوی کردن و کەمڕەوی کردنیەتی.

١٢-قال بعض السلف: «اقْتِصَادٌ فِي سَبِيلٍ وَسُنَّةٍ، خَيْرٌ مِنَ اجْتِهَادٍ فِي خِلَافِ سَبِيلٍ وَسُنَّةٍ»[٣].

واتە: مانەوە لەسەر سوننەت باشترە لە کاری زۆری بیدعە.

---

(١) مدارج السالكين (٢/ ١١٢).

(٢) مدارج السالكين (٢/ ١٠٥).

(٣) مدارج السالكين (٢/ ١٠٥).

**١٣**-قال مسروق: «كَفَى بِالْمَرْءِ عِلْمًا أَنْ يَخْشَى اللهَ، وَكَفَى بِالْمَرْءِ جَهْلًا، أَنْ يُعْجَبَ بِعِلْمِهِ»[(١)].

**واتە: بەسە خاوەنی زانستی تەواو بێت كاتێ لەخوا ترساندنت هەبێت، وە بەسە بۆ كەسێك نەزان بێت كاتێك سەرسامە بە كارەكانی.**

**١٤**-وقال عمر بن الخطاب ﷺ: «عَلَيْكُمْ بِذِكْرِ اللهِ فَإِنَّهُ شِفَاءٌ، وَإِيَّاكُمْ وَذِكْرَ النَّاسِ فَإِنَّهُ دَاءٌ»[(٢)].

**واتە: ئاگاتان لە یادی خوا بێت ئەوە شیفایە، وە دوور بن لە باسی خەڵكی ئەوە دەردە.**

**١٥**-قال بعض السلف: «لَمُصَانَعَةُ وَجْهٍ وَاحِدٍ أَيْسَرُ عَلَيْكَ مِنْ مُصَانَعَةِ وُجُوهٍ كَثِيرَةٍ. إِنَّكَ إِذَا صَانَعْتَ ذَلِكَ الْوَجْهَ الْوَاحِدَ كَفَاكَ الْوُجُوهَ كُلَّهَا»[(٣)].

**واتە: ڕووكردنە یەك ڕوو كارئاسانترە تاوەكو ڕوو دەكاتە چەندەها ڕوو، ئەوە یەك ڕووە كاری ڕووەكانی ترت بۆ ئاسان دەكات.**

---

(١) رواه الدرامي (٣٢٢، ٣٩٥) وقال محققه: إسناده صحيح.

(٢) ابن أبي الدنيا في " الصمت " (٢٠٣).

(٣) مدارج السالكين (٢/ ٢٩٥).

# ناوەڕۆك

**بابەت** **لاپەڕە**